# بزاڤی گەشتوگوزار
# لە هەرێمی کوردستان

سەردار عەبدولڕەحمان









# نـاوەنـدی ڕۆشنبیریی ســـارا

بەڕێوبەری گشتی ناوەند :دارا ڕەشید

بەڕێوەبەری چاپ: ئـــارام عـوسمان




نـاوەنـدی ڕۆشنبیریی ســـارا - بۆ چاپ وبلاوكردنەوە

(چـــــاپەمەنی - كتێبخـــــانە - كـــــافتریا - ئینتەرنێت)

ناونشان: سلێمانی-بازاڕی ئاوباریك -نهۆی دووەم - بەرامبەر كاسۆمۆڵ

www.facebook.com/nawendi.sara.org

+964 0751 538 3505 - +964 0770 247 4597

## ناسنامەی کتێب


ناوی کتێب: بزاڤی گەشتوگوزار لە هەرێمی کوردستان

نووسینی:سەردار عەبدولڕەحمان

نەخشەسازیی : هونەر عوسمان

قەبارە : (١٤*٢١)، ٧٦ لاپەڕە

نۆبە و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم/ ٢٠١٩

شوێنی چاپ : ناوەندی سارا _ سلێمانی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ : ٢٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (    )ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە


بزاڤی گەشتوگوزار لە هەرێمی کوردستان


ناوەندی سارا

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی_بازاڕی ئاوباریك

٠٧٥١ ٥٢٨ ٢٥٠٥




## ناوەڕۆک

# پێشەکی

گەشتوگوزار لەرۆژگاری ئەمرۆماندا بەتایبەتی لەسەردەمی بەجیهانیبووندا بەیەکێک لەچالاکییەکانی چەرخی تازەو پێداویستییەک لەپێداویستییەکانی سەدەی (٢١) دادەندریت، بزاڤی گەشتوگوزار وەک لایەنێکی گرنگی پێشکەوتنی شارستانی هەر گەل و نەتەوەیەک لەقەڵەم دەدرێت، چونکە بە بنەمایەکی گرنگی پیشەسازی نوێ دائەندرێت و، هەروەها رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لەبەرەوپێش چوونی ئاراستەکانی جیهانگیرییدا، لەگەڵ ئەمەشدا گەشتوگوزار وەک هەر چالاکییەکی دیکەی بوارەکانی ئابووری بەبنەمایەکی گرنگی سەرچاوەی داهاتی نەتەوەیی و نیشتیمانی لەقەڵەم ئەدرێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گەشتوگوزار وەک پیشەیەکی تازەوەبوو بە پیشەی هەوێنی شارستانی کەلتوورەکان ئەژمار ئەکرێت و زمانی بەهاو مۆڕاڵ و پلە ی رۆشنبیری و ناسنامەی پێشکەوتنی گەلانە، وەسەرەڕای ئەمەش ئەمڕۆ وەک چەکێکی گرنگ بۆتە کارنامەی پارت و رێکخراو حیزب و کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ بانگەشەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ، کەبایەخی زۆری پێدراوە بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا کەبۆتە پێداویستییەکی گرنگی ژیاری کۆمەڵی مرۆڤایەتی، لەم بارەیەوە لیکۆڵەرەوانی تایبەت بەم بوارە گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامەی کەئاماژە بۆئەوە بکەن کەئەمڕۆ گەشتوگوزار وەک

چالاكییەكی گرنگی سەردەم پلەی چوارەمی داگیركردووە لەپێداویستییەكانی مرۆڤایەتی دوای (نان خواردن و جلوبەرگ و شوێنی حەوانەوە). ئەگەر بێتو مرۆڤ لەرۆژگاری ئەمرۆماندا یەكێك لەم سێ پێداویستییەی كەم بووبێت ئەوا ژیانی بەنارێك خەملاندووە، بەڵام مرۆڤی شارستانییەتی ئەمرۆ لەسایەی بەرهەمەكانی پێشكەوتن و جیهانگیریدا ئەگەر گەشتوگوزار وەك چالاكییەك لەچالاكییەكانی ژیانیدا بەئەنجام نەگەیەنێت ، ئەوا وەك ئەوە وایە یەكێك لەپێداویستییەكانی كەم بووبێت.

گەشتوگوزار ئەمرۆ وەك لایەنێكی گرنگی كەرتی ئابووری بەشدارییەكی فراوانی هەیە لە گەشەكردنی هەریەكە لەبوارەكانی ژیاری كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ، وەهەروەها ساڵ بەساڵیش گرنگی و بایەخی ئەم كەرتە دێتە ڕیزی پێشەوەی پێداویستییە سەرەكییەكانی مرۆڤ، هەر لەم بوارەشدا زانای ئەمریكی (جۆن نیبزت) جەختی كردۆتەوە لەسەر ئەوەی كەئابووری وەك بزوێنەرێكی سەرەكی لەجیهاندا لەسەدەی داهاتوودا. لەلایەن سێ پیشەسازی خزمەتگوزارییەوە بەڕێوەدەبرێت كەئەوانیش بریتین لە:-

(پیشەسازی پەیوەندییەكان، پیشەسازی تەكنەلۆژیای زانیارییەكان، پیشەسازی خزمەتگوزاری گەشتوگوزاری)، هەر لەم بارەیەوە (وانگاری ماسای) كەهەڵگری خەلاتی نۆبلە دەڵێت: ((گەشتوگوزار هۆكارێكی گرنگە بۆ هێنانەدی ئاشتی )) وەهەروەها (كۆرازۆن گچالیان و سیندی ڕیمان) دەڵێن: (( بەهۆی ئەوەی

گەشتوگوزار پەیوەندی نێوان نەتەوەکان بەرزدەکاتەوە دەتواندرێت ببێتە ئامێرێک بۆ دروستکردنی زمانێکی ئاشتی جیهانی.

**گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە:-**

گرنگی ئەم لێکۆلینەوەیە لەوەدا دەردەکەوێت کە جیاکردنەوەو دیاریکردنی توانستەکانی خستنەرووی گەشتیاری هەرێمی کوردستانە بۆ ئەو چالاکیە گەشتوگوزاریانەی لەگەڵیدا دەگونجێت بەمەبەستی بەردەوامیدان بە چالاکییە گەشت وگوزاریەکان لەوەرزە گەشت وگوزاریەکاندا، وەهەروەها دەستنیشانکردنی گرفت و چۆنیەتی پەرەپێدانی بزافی گەشتیارییە لەهەرێمی کوردستان.

**ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە:-**

ئامانجی سەرەکی لەلێکۆڵینەوەکەماندا بریتیە لەدەرخستنی رۆڵی بنەما جوگرافیە سروشتی ومرۆییەکانی ناوچە گەشتوگوزاریەکانی هەرێمی کوردستان و سیماو گیروگرفتی بزاڤی گەشتیاری لەسەر دروست بوون وگەشەپێدان وپەرەپێدانی گەشتوگوزارو دەرخستنی ڕۆڵی واقیعیانەی لەرووی بایەخی گەشتوگوزارییەوە.

**میتۆدی لێکۆڵینەوە:-**

بەمەبەستی سوود گەیاندنی زیاتر بەلێکۆڵینەوەکەمان لەم ڕوانگەیەوە میتۆدی(ئسوڵی وشیکردنەوەمان)گرتۆتە بەر، چونکە لەگەڵ پێکهاتەو ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکەماندا گونجاوە.ئەم میتۆدە گرنگە بۆ دەرخستنی ڕۆڵ وکاریگەری فاکتەرە جوگرافیەکان لەسەر چالاکی و لایەنە جیاوازەکانی گەشتوگوزار.

## گیروگرفتەکانی بەردەم لێکۆڵینەوە:-

لێکۆلینەوە لەبابەت و چالاکییە گەشتوگوزار بێ گومان کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو چەندین گیروگرفت هاتوونە بەردەم لێکۆڵینەوەکەمان وەکو کەمی توێژینەوەو لێکۆلینەوەی زانستی وسەرچاوە لەسەربابەتی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان بەگشتی و وەهەروەها کەمی لێکۆڵینەوەکان لە سەر بابەتی گەشت وگوزار بە زمانی کوردی بە تایبەتی کە کێشەی وەرگێڕانی بۆ دروست کردبووین، چونکە زۆر لە زاراوەکان لە زمانی کوردیدا بێ بەرامبەر یان نامۆ بوو.نەبوونی ناوەندێکی زانستی و ئەکادیمی پشت بەستوو بەداتاو ئاماری راست و دروست سەبارەت بە هاتنی گەشتیاران سالانە ، وەهەروەها نەبوونی یاخود ناتەواوی لەتۆمارکردنی زانیاری و داتاکان بۆماوەیەکی دووروودرێژ کێشەی بۆتوێژەر دروست کردووە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا.

## پێکهاتەو ناوەرۆکی لێکۆڵینەوە:-

دەرخستنی ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە هەوڵدراوە دابەش بکرێت بۆ پێشەکیەک و دوو بەش کەبریتین لە:-

**بەشی یەکەم/** ئەم بەشە تایبەت کراوە بە ((توانستە گەشتوگوزاریەکان و کاریگەریان لەسەر بزاڤی کەرتی گەشتیاری لە هەرێمی کوردستان)) کەئەمیش خۆی لەسێ باسی گرنگدا دەبینیتەوە کە باسی یەکەم بریتیە لە (بایەخی توانستە جوگرافیە گەشتوگوزارییەکاییەکانی هەرێمی کوردستان) و وەهەروەها باسی

دووەمیش تەرخانکراوە بۆ (هۆکارەکانی گەشەکردن و پەرەپێدانی بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان) وە باسی سێیەمیش تەرخانکراوەبۆ (هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیی هەرێمی کوردستان لەڕوانگەی گەشتیارییەوە).

**بەشی دووەم/** ئەم بەشە تایبەت کراوە بە ((سیماو گیروگرفتی بزاڤی گەشتوگوزار و هەنگاوەکانی پلاندانان بۆ چۆنیەتی گەشەپیدانی لە هەرێمی کوردستان)) کەئەمیش خۆی لەسێ باسی گرنگدا دەبینیتەوە کە باسی یەکەم بریتیە لە (ئاستەکانی بەردەم بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان) وەباسی دووەم بریتی یە لە (شێوەکانی پلاندانان بۆ چۆنێتی گەشەپێدانی گەشت و گوزار لە هەرێمی کوردستان) وەباسی سێیەم بریتی یە لە (هەنگاوەکانی چۆنیەتی چارەسەرکردنی بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان).

# بەشی یەکەم

## توانستە گەشتوگوزارییەکان و کاریگەرییان لەسەر بزاڤی کەرتی گەشتیاری لە هەرێمی کوردستان

**باسی یەکەم :-**

چەمک و زاراوەکانی گەشتوگوزار

**باسی دووەم:-**

بایەخی توانستە جوگرافییە گەشتوگوزارییەکانی هەرێمی کوردستان.

**باسی سێیەم:-**

هۆکارەکانی گەشەکردن و پەرەپێدانی بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان.

**باسی چوارەم :-**

هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیی هەرێمی کوردستان لەڕوانگەی گەشتیارییەوە.

**باسی پێنجەم:-**

پەیوەندی نێوان زانستی جوگرافیا و بزاڤی گەشتوگوزار

# باسی یەکەم
# چەمک و زاراوەکانی گەشتوگوزار

گەشتوگوزار لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پیشەسازیەکی نوییە و ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە ئابووری ونیشتیمانی و دەستەبەرکردنی داهاتی نەتەوەیی،گەشتوگوزار وەک چالاکیەک بەردەوام لەنوێ بوونەوەدایە بەمەش دەتواندرێت بەبەردەوامی بەبێ گۆڕان سوودی ئابووری و کۆمەلایەتی لێوەربگیرێت،هەروەها گەشتوگوزار لەژێر ئاراستەکانی جیهانگیریدا ناساندنی گەشتیارانە بەرووی گەشتیارانی دەرەوە،چونکە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان گەشەسەندنی ئابووری وکۆمەلایەتی و بوونی توانستەکانی وەگەڕخستنی گەشتوگوزاری لەهەر ناوچەیەکدا هەیە، لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کەرتی گەشتوگوزار خۆی لەخۆیدا سەرچاوەی بنەڕەتیە لەبەرهەمی نەتەوەیی، چونکە دەکرێت لەڕێگای ئەم کەرتەوە وەبەرهێنانی خۆماڵی و بێگانە زیاتر بەرهەمە نەتەوەییەکە بەهێز بکەین، ئەویش لەڕێگای بوونیاتنانی کۆمەلگای گەشتیاری گەورە لەناوچە گەشتوگوزاریەکاندا.

## ناساندنی چەمک و زاراوەکانی گەشتوگوزار:-

دەستنیشانکردن ودیاری کردنی زاراوەکانی گەشتوگوزار لەڕێگای خستنەڕووی بیرو بۆچونی پسپۆڕو لێکۆڵەرەوەکانەوە پێویستی بەشیکردنەوەو لێکۆلینەوەی وورد هەیە، چونکە هەریەک

لەمانـــای گەشتیاروخۆشـــگوزەرانی وکاتەکـــانی دەســـت بەتـــاڵی تێکەڵچوون وکاریگەریـان لەسـەر یەک هەیە،کەواتە دیـاری کردنی ئەم زاراوانە کـــــارێکی بنەڕەتــــــی وپێویســـــــتە لەگشـــــت لێکۆڵینەوەجـوگرافیە گەشـــتوزاریەکاندا، هەربـــۆیە بەپێویســـتی دەزانین کە لێرەدا بەکورتی ئاماژە بۆهەندێ لەم زاراوانە بکەین.

## یەکەم/ گەشتـــوگـــوزار:-

گەشـــتوگوزار وەک دیـاردەیەکی مرۆیـی وشارسـتانی سـەری هەڵداو چەندین دەوڵەت گرنگیان پێداوە، لەئەنجامدا لەساڵی (١٨٩٨) یەکەمین ڕێخراوی نێودەوڵەتی بۆ سەرپەرشتی کردن ورێکخستن وپەرەپێـــدانی گەشـــتوگوزار بەنـــاوی (یەکیەتـــی نێـــودەوڵەتی کۆمەڵگاکـانی گەشتوگوزار)درووســت بــوو لەســاڵی (١٩٢٥) دا لە لاهـای (کـۆنگرەی نێـودەڵەتی کـۆمەڵە فەرمیەکـانی پڕوپاگەنـدەی گەشتوگوزاری) دامەزێندرا، دواترو لەساڵی (١٩٤٩) ناوی گۆڕدرا بـۆ (ڕێخـراوی گەشـتوگوزاری نێـودەوڵەتی) (WTO) بارەگـاکەی لەشـــاری (مدریـــد) لە ئســـپانیایە،چەمکی گەشـــتوگوزار لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگادا پێشکەوتووە، لەفرهنگی ئۆکسفۆردا ووشـەی (tour) بەبنەرەتـــی زاراوەی (tourism) دادەنـــدرێت، بەمانـــای گەشتێکە لەماڵەوە دەست پێ دەکات هەر لەوێش کۆتـایی پێ دێت، یەکەمین پێناسە بۆ گەشتوگوزار دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم لەساڵی (١٩٠٥) لەلایەن(جویرفرویلر)ی ئەڵمانی کرا، دواتر لەلایەن زانـا (هـونزیکر) و (علاالـدین الکبری.......هتدد)پێناسـەی جوراوجۆری بۆکراوە[١]

لەم بـــارەیەوە (د.ئازادمحمـــدامین نقشـــبەندی) دەڵێـــت (گەشـتوگوزار کۆمەڵێـک دیـاردەو چـالاکی مرۆیـی وپەیوەنـدیە، لەئەنجامی کردارەکانی گواستنەوەی کاتی ئەو کەسانە درووست دەبێت کەسـەردانی چەنـد نـاوچەیەک دەکەن لەدەرەوەی نـاوچەی نیشتەجێ بوونی خۆیان، بەچەند مەبەستێک وکەپەیوەندی دارنیە بەدەسکەوتن و سوودی داراییەوە)[٢]

## دووەم / گەشتـیـار (tourist):-

لەهەر لێکۆڵینەوەیەکی گەشتوگوزاریدا ناسینی گەشتیار گرنگی و تـایبەتی خـۆی هەیە، لەڕووی زمـانەوانیەوە لەفەرهەنگـی ئۆکسفۆڕدی بەڕیتانیادا دەڵێت (گەشتیار کەسێکە کەگەشت بکات یان سەردانی شوێنێک بکات بۆچێژ وەرگرتن لەدیمەنـی ئەوشوێنە) زانا (ئۆجلفی) لەسـاڵی ١٩٣٣ز لەڕوانگەیەکی ئـابووریەوە پێناسـەی بۆگەشـتیارکردووە دەڵێـت هەمـوو ئەو کەسـانەن کە دوو مەرج لەخـۆدەگرن، یەکەمیـان ئەوەیە کەلانەی هەمیشـەیی خۆیـان بەجێبهێڵن بۆمـاوەی کەمتـر لەسـاڵێک دووەمیـان ئەوەیە کەبەهـۆی جێنشـینیان لەدەرەوەی وولاتـدا خەرجیـان لەوشـوێنەدەبێت کە بەشـێوەیەکی کـاتی تێیـدا جێنشـین دەبـن، ئەو پێناسـانەی کە پسـپۆڕانی بـواری گەشـتوگوزاری دەربـارەی زاراوەی گەشـتیار ووتویانە دەبینین لەچەندخالێکدا هاوبەشن وەک (گۆڕینی شوێنی هەمیشەیی گەشتیارو وەئەوماوەیەیی پێویستە گەشتیار لەناوچەی گەشتەکەیدا بمێنێتەوە لەزیـاتر لە ( ٢٤) کاتژمێریـان خەملاندووە مەبەستی سەردانەکەیان نابێت بۆ دەسکەوتی ماددی بێت) کەواتە

دەتوانین بڵێین (گەشتیار ئەو کەسەیە کەشوێنی نیشتەجێبوونی خۆی جێ دێلێت بۆ ماوەیەکی کاتی کەکەمتر نەبێت لە (٢٤) کاتژمێرو زیاتریش نەبێت لە ساڵێکی تەواو بڕینی ئەو ماوەیە بەمەبەستی دابینکردنی حەزووئارەزووەکانی کەپەیوەندیان نیە بە بەدەستهێنانی دەسکەوتی ماددیەوە)[٣].

### سێ یەم/ خۆشگوزەرانی (recreation):-

خۆشگوزەرانی وەک هەر چەمکێکی تر واتاو تێگەیشتنی جۆراوجۆری خۆی هەیە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو جیاوازییەی لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و رادەی گۆڕانکاری پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاو شارستانی لەنێوان کۆمەڵگاکاندا هەیە، چەمکی خۆشگوزەرانی (recreation) پێکهاتووە لە(re)بەمانای دووبارە (creation) بەمانای درووست کردن یاخود گێڕانەوەی چالاکی دێت، لەم ڕوانگەیەوە پێناسەی زۆرو جۆراوجۆر بۆ خۆشگوزەرانی هاتۆتە کایەوە لەلایەن پسپۆڕانی بواری جوگرافیای گەشتوگوزار، لیژنەی پسپۆرانی سەرپەرشتی لاوان لەووڵاتانی عەرەبی وایان ناساندووە کە خۆشگوزەرانی (چالاکیەکی ئاسایی‌یەو مەبەست خودی مرۆڤە، نەک دەسکەوتی ماددی، چونکە بۆ بوژانەوەی توانستەکانی تاک لەڕووی وەرزشی وکۆمەڵایەتی و دەروونییەوە لەکاتە پشووەکاندا ئەنجام دەدرێت)[٤].

ماوەتەوە بڵێین کەخۆشگوزەرانی وگەشتوگوزار دووزاراوەی جیان لەیەکتری بەڵام لەهەمان کاتدا تەواوکەری یەکترین هەربۆیە دەڵێین [٥].

١- ئامانجی گەشتوگوزار بۆبەدیهێنانی خۆشگوزەرانییە، بەڵام مەرج نیە هەمووچالاکیەکی خۆشگوزەرانی ببێت بەگەشتوگوزار .

٢- لەکاتی ئەنجامدانی خۆشگوزەرانی مەرج نیە مرۆڤ شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی خۆی جێبێڵێت.

٣- دەکرێت چالاکی خۆشگوزەرانی لەماوەیەکی کەمتر لە (٢٤) کاتژمێردا ئەنجام بدرێت.

٤- مەرج نیە لەکاتی ئەنجامدانی چالاکی خۆشگوزەرانی گەشتیار دووریەکی دیاری کراو ببڕێت.

## چوارەم/ دەست بەتاڵـــی (leisure):-

لەڕووی زمانەوانییەوە چەمکی (leisure) لەووشەی لاتینی (licer) ەوە هاتووە، بەمانای ئەوە دێت مرۆڤ ئازاد بێت لەکارەکانی، بەشێکە لەکاتی ئەو کەسانەی بەچالاکیە سەرەکیەکانی تری وەک کارکردنەوە سەرقاڵ نین، کەواتە دەتوانین بڵین کاتەکانی دەست بەتاڵی (ئەو کاتەیە کەلەپاش کاتەکانی کارکردن و بەرپرسیاریەتی و ئەرکەکانی ژیانی ڕۆژانە لە مرۆڤ دەمێنێتەوە کە پێویستە کاتەکانی بەشێوەیەک ڕێک بخات لەگەڵ ووزەو توانستە جەستەیی وهۆشییەکانیدا بگونجێت وبەشێک لەکاتەکانی خۆی بۆ چالاکیە گەشتوگوزارییەکان وخۆشگوزەرانیەکان تەرخان

بکات بەشێوەیەک لەئاستی بژێوی وئارەزووە کۆمەڵایەتیەکانیدا بگونجێت)[٦].

زیادبوونی قەبارەو کاتی دەست بەتاڵی ئەگەرەکانی هەڵسان بەچالاکیە گەشتوگوزارییەکان زیاد دەکات، هەروەها گرنگترین هۆکارەکانی زیادبوونی کاتی دەست بەتاڵی بریتین لە[٧]:-

١- پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاو کاریگەری لەسەر کەمکردنەوەی دەستی کار.

٢- زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان.

٣- زیادبوونی قەبارەی مۆڵەتەکان و پشووە فەرمیەکان.

٤- پێشکەوتنی باری تەندرووستی وکەم بوونەوەی تێکڕای مردن.

٥- پێشکەوتنی هۆیەکانی گواستنەوەوگەیاندن.

٦- دامەزراندنی چەندین ڕێخراوی کرێکاری بۆ کەمکردنەوەی کاتەکانی کارکردن.

## پێنجەم/ جوگرافیای گەشتوگوزار:-

جوگرافیای گەشتوگوزار بەشێکی تازەیە لەجوگرافیای مرۆیی، بەلام بەشێوەیەکی روون وئاشکرا یەکەم کەس کە جوگرافیای گەشتوگوزاری بەکارهێنا (ستراندلر) بوو لەساڵی (١٩٠٥)، جگە لەوە (سامۆلینز) گرنگی دا بەهۆکارە سروشتی و مرۆییەکان و دانانیان بەهۆکارێکی سەرەکی کە دەتوانین گەشتوگوزاری لەسەر بنیات بنێین، هەروەها (د.احمد حسن) دەڵێت (جوگرافیای گەشتوگوزار لقێکە لە لقەکانی زانستی جوگرافیا گرنگی ئەدات بە

لێکۆڵینەوە لە گەشتوگوزارو بەسەربردنی کاتەکانی دەست بەتاڵی و بنەماکانی جوگرافیای سروشتی)[٨]

هەروەها (s.leszcyck) بەم شێوەیە پێناسەی گەشتوگوزار دەکات دەڵێت (جوگرافیای گەشتوگوزار دەستنیشانکردنی زانستیانەی بەهای گەشتوگوزارە بۆ ژینگەی سروشتی ولێکۆڵینەوە لەتوانای جموجۆڵی گەشتیاران و لەگەڵ پاریزگاری کردن لە تایبەتمەندی ژینگەو بەرهەمهێنانی ژیرانەی بۆ ئەم جموجۆڵە).

هەروەها جوگرافی ناسی عێراقی (د.صباح محمود) دەڵێت (جوگرافیای گەشتوگوزار گرنگی ئەدات بە لێکۆینەوە لەجوولەی دانیشتوان لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر یاخود لەهەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر، ئەگەر لەناو خودی وولات دابێت پێی دەووترێت گەشتوگوزاری ناوخۆیی، ئەگەر لە دەرەوەی سنووری وولات دابوو پێی دەووترێت گەشتوگوزاری دەرەکی)[٩].

# باسی دووەم

# بایەخی توانستە جوگرافییە گەشتوگوزارییەکان لە هەرێمی کوردستان:-

هەرێمی کوردستان وەک مەڵبەندو ناوەندێکی گرنگی ناوچەیی لەزۆر ڕوانگەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کلتووری لەروانگەی جیهانگیریەوە پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، بێگومان ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر رەنگدانەوەی تێکڕای چالاکیە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ لەهەرێمەکەدا،

گەشتوگوزار ئەمرۆ بۆتە یەکێک لەپێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی مرۆڤ لەناوچەکەدا، چونکە بەبنەمایەکی گرنگی چالاکی پشووی جەستەیی و ژیری وئەقلی لەقەڵەم ئەدرێت ، توانستە جوگرافیە گەشتوگوزاریەکان ئەو توانستانە دەگرێتەوە کە دەبنە بنەمای پەیدابوون و گەشەکردنی چالاکی گەشتوگوزاری، یەکێکە لەبنەماکانی بوژانەوەی ئەو کەرتەو پەرەپێدانی شانبەشانی دەزگای کارگێڕی وئابووریەکان ، ئەم بنەمایانە سروشتی بن یاخوود مرۆیی، تا ناوچەکە دەوڵەمەندتر بێت بەتوانستە گەشتوگوزاریەکانی ئەوا هێزی ڕاکێشانی گەشتیاران زیاتر دەبێت و دەبێتە هۆی پەرەپێدانی بزاڤی گەشتیاری، توانستە گەشتوگوزاریە سروشتیەکان زۆرو جۆراوجۆرن، دەتوانین بڵێین توانستە سروشتییەکان بەبنەماو فاکتەرێکی سەرەکی دادەندرێن

بەلای زۆرێــــک لە گەشــــتیاران بــۆ دەستنیشــــانکردنی نــــاوچە گەشــــتوگوزاریەکان، چــــونکە دیمەنــــی جــــوانی سرووشــــت و هەمەچەشــــنەی ڕووخســـــارەکانی رووی زەویـــــی و ئــــاووهەوای گەشتیاری هەر نـاوچەیەک کەرەسـەیەکی خـاوی گەشتوگوزارین، بـوونی ئەم توانسـتانە لە هەرێمـی کوردسـتان بەبـڕو خەسـڵەتی جیاواز دەردەکەون[١٠].

هەرێمی کوردستان زۆر توانـای سروشـتی و مرۆیی تێدایە، کە دەسـتاوێژو ئـامرازی پێویسـتن بـۆ نەشـونماکردن و پێشـکەوتنی گەشتوگوزار تێداو بوونەتە مـایەی ئەوەی کەهەندێک لەناوچەکانی کوردستان  ببنە گرنگترین شوێنی گەشتوگوزار لەعێراقدا و ڕێژەی هەرە گەورەی دامەزراوە گەشـتوگوزارییەکان لەسـەرتاپای عێـراق لەباوەش بگرن، کەمـی و بەگـران دەسکەوتنی سـەرژمێری تـایبەت بەگەشتوگوزار وایکردووە.

نەتـوانین حـوکمێکی وورد بەســەر واقیعـی ئەو بـزاڤە گـرنگەو پەرەگرتنیدا بدەین[١١].

# باسی سێیەم
## هۆکارەکانی گەشەسەندن و پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان

چالاکییە گەشتوگوزارییەکان لەرۆژگاری ئەمرۆماندا بوتە پێویستیەکی گرنگ لەپێداویستەکانی تری مرۆڤایەتی شان بەشانی بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی خەڵک و رێکخستنی کاتەکانی کارکردن و قۆستنەوەی کاتەکانی پشوو، سەرجەم فاکتەرەکانی گەشەکردنی گەشتوگوزار کەلەخوارەوە ئاماژەمان پێکردوون یارمەتیدەرێکی باش بوون بۆ کردنەوەی بوارێکی فروانتر بۆ گەشتیار تا حەزوو و ئارەزووە جۆربەجۆرەکانی خۆی تێر بکات، ئەمەش لەڕوانگەی پشووی جەستەیی و دەروونی و بەسەربردنی کاتەکانی دەست بەتاڵی بوارێکی گرنگ بەئادەمیزاد دەبەخشێت، لێرەدا دەتواندرێت گرنگترین ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکەین کە دەورێکی بالاًیان هەیە لە گەشەکردن و پەرەپێدانی گەشتوگوزار لە هەرێمی کوردستان کە بریتین لە [١٢]:-

١- زیادبوونی هەست و ئارەزووی تاک بۆ خۆشگوزەرانی ژیان و و بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری مرۆڤ و دورکەوتنەوەی مرۆڤ لە کوتکردن و نەمانی قەیران و سەرهەڵدانی کێشە سیاسییەکانی وولات .

٢- هەنگاوەکانی پێشکەوتنی چالاکی ئابووری، بەرزبوونەوەی ئاستی داهاتی تاکەکەس لەداهاتی نەتەوەیدا.

٣- پەرەسەندن و گەشەسەندنی بەربلاوی تۆرەکانی گواستنەوە (هەوایی و ئاوویی و ووشکانی) کەبێگومان هەموو ئەمانەش بوونەتە هۆی پەرپابوونی شۆرشێکی گەورە لەجیهانی گەشتوگوزاریدا.

گەشەسەندنی هۆیەکانی تەکنەلۆجیا کەبووە هۆی کەمکردنەوەی کاتەکانی کارکردن و زۆربوونی رۆژە پشووەکان، لەلایەکی تریشەوە سەرهەڵدانی چەندین ریکخراوی کرێکاری لەکوردستان کەهەوڵی کەمکردنەوەی کاتەکانی کارکردن دەدات بۆ هاولاتیان.

٤- دەرکەوتنی ئارەزوو و پێداویستیەکانی مرۆڤایەتی وەک پێداویستسەکی سەردەم کەخۆی دەبینیتەوە لە ( بواری رۆشنبیری و تەندروستی و گەشتوگوزاری ......هتدد) بەشێوەیەکی بەرفراوان، کەبوونی هەموو ئەمانە لایەنێکی بەرچاوی پێشکەوتنی بزاڤی گەشتوگوزارین لە هەرێمی کوردستان.

٥- گرنگی دانی گۆمەڵگای نێودەولەتی بەچالاکی گەشتوگوزار وەک چالاکیەکی مرۆڤایەتی سەرەکی نوێی ئەم رۆژگارە، وەپێشکەوتنی کۆمەڵگاکان لەسەر پیشەسازی گەشتوگوزار.

٦- زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و باش بوونی بارووودۆخی تەندروستی و کەمبوونەوەی رێژەی مردن و پێشکەوتنی ژیان لە هەموو روانگەیەکەوە.

# باسی چوارەم

## هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیی هەرێمی کوردستان لەڕوانگەی گەشتیارییەوە

شوێنی جوگرافیی فاکتەرێکی کاریگەرە لەسەر داواکاری گەشتوگوزاری، هەروەها فاکتەرێکی هاوبەشە لە کاریگەر خستنە سەر جموجۆڵی گەشتوگوزاری لە هەردوو ژینگەی خستنە روو و داواکاریدا لەیەک کاتدا، جگە لەوەی شوێنی جوگرافی بەڕەگەزێکی گرنگ و روون دادەندرێت لەسەر بزاڤی گەشتوگوزاری لەهەر ناوچەیەکدا لەنێوان ئەم دوو ژینگەیەدا، وەهەروەها کاریگەری هەیە لەسەر دووری و نزیکی ناوچەکە لەڕووی داواکاری و خستنە رووودا. بەو پێیەی ناوچەی هەرێمی کوردستان لەڕوانگەی سروشتی یەوە بەبەراورد لەگەڵ خاکی عێراق دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکانی عێراق، کەلەتوانای دا هەیە ببێتە ناوچەیەکی گەشتوگوزاری سەرنجراکێش لەسەر ئاستی هەرێمی و جیهانی، هەروەها بوونی دیمەنە سروشتییەکان و جۆراوجۆری و جیاوازی گەورە لەشێوەکانی رووی زەویەکەدا هەر لەچیاکان و ڕێڕەو و دەربەندو دۆڵە تەسک و قوڵەکان ودەشتەکان و بوونی ئاووهەوایەکی مامناوەندو زۆری سەرچاوە ئاوییەکانن، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی دروستکردنی چەندین ژینگەی جیاوازو نزیک لەیەک لەناوچەکەدا، کەگەشتیاران دەتوانن لەژینگەیەکی گەرمەوە لەدۆڵ و دەشتەکاندا بڕۆن بۆ ژینگەیەکی سارد لەچیاکان[١٣].

شوێنی جوگرافی هەرێمی کوردستان بەپێی بازنەکانی پانی بە هۆکارێکی کاریگەر دادەنرێت لە دەستنیشانکردنی ڕواڵەتە سرووشتی و مرۆییەکاندا، دواجار دەتوانین ئەو ناوچە گەشتوگوزاریانە دیاری بکەین کە توانای ڕاکێشانی گەشتیاری هەیە لەگەڵ دەستنیشانکردنی کاتی گونجاو بۆ ئەنجام دانی چالاکییە گەشتوگوزارییەکان و جۆری شێوازەکانی گواستنەوە لەهەرێەکە بەپێی ئارەزوو مەبەستی گەشتیاران، شوێنی ئەسترۆنۆمی هەرێمی کوردستان دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی پانی ( ٣٣.٠٧٥ _٣٧.٢٢٥ ) هەردوو هێڵی درێژی ( ٤١.٠٨٥ - ٤٦.١٨٥) هەڵکەوتەی شوێنی هەرێمی کوردستان بەگوێرە بازنەکانی پانی گاریگەیەکی زۆری هەیە لەسەر جۆرو چالاکی ئابووری و سیاسی و گەشتوگوزارو لایەنەکانی تر[١٤].

هەرێمی کوردستان بەگوێرەی هەڵکەوتەی شوێنی فەلەکی (ئەسترۆنۆمی) دەکەوێتە باکورو باکوری خۆرهەڵاتی عێراق، کەبەگرنگترین ناوچەکانی هەرێمی شاخاوی لەقەڵەم ئەدرێن ، کەبێگومان ئەمەش بنەمایەکی گرنگی چالاکی گەشتوگوزارە لەهەرێم دا، چالاکی گەشتوگوزاری لەڕۆژگاری ئەمرۆماندا، جۆراوجۆری لەدیمەنە سروشتیەکانی سەر ڕووی زەوی بەگرنگترین هۆکارەکانی سەرنج ڕکێشانی گەشتیاران دادەندرێت بۆ هەر ناوچەیەک کە گرنگی و بایەخەکەی زیاد دەکات، لەم بارەیەوە (د.صلاح الدین عبدالوەهاب) ئەوە دووپات دەکاتەوە کەجۆراوجۆری دیمەنە سروشتیەکان و جیاوازی پێکهاتەو دیاردە سروشتیەکان و ئەو شوێنەوارانەی کەبارودۆخی ئاووهەوا

دروستیان کردووه لەجیاوازی رووەک و ئاژەڵ، ڕەگەزێکی گرنگی ڕاکێشانی گەشتیارانن لەبەرامبەر ئەم ناوچانەوە [١٥].

دیاریکردنی شوێنی جوگرافی بەرپرسە لەروودانی چەندین چالاکی سروشتی لەناوچکەدا. [١٦]:-

١- کەم و زۆری مەودای گەرمی ساڵانە.کەوەرزی گەشتیاری دیاری دەکات.

٢- دەرکەوتنی چوار وەرزەی ساڵ لەناوچە شاخاویەکاندا ، کە ئەمەش پەیوەستە بە گەشتوگوزاری وەرزی

٣- دیاریکردن و دەرکەوتنی کاتەکانی باران و شێوازەکانی دابارین.

ئەمانەش کاریگەریان هەیە لەسەر رووەکی سرووشتی و بەرهەمی کشتوکاڵی و چالاکی ئابووری و گەشتوگوزاری و دابەش بوونی دانیشتوان وشێوازی ژیانی مرۆڤ لەناوچەکەدا.

٤- شوێنی ئەسترۆنۆمی کاردەکاتە سەرکەش و هەوا لەرێگای ئەو بڕە تیشکەی کە دەگاتە سەر ڕووی زەوی، ئەو جیاوازیەی لەو بڕەدا درووست دەبێت لەوەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تر، دەبێتە هۆی جیاوازی لەپلەکانی گەرمی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر.

شوێنی جوگرافیای هەرێمی کوردستان بەگوێرەی وولاتانی دراوسێ و بەشەکانی تری خاکی عێراق کاریگەری گرنگی دەبێت لەراکێشانی گەشتیاران لەدەرەوەو ناوەوەی سنوری هەرێمی کوردستان، سەرەرای ئەمەش شوێنی جوگرافی هەرێمی کوردستان کاریگەریەکی گرنگ و بەرچاوی هەیە لەدیاریکردنی ڕەواڵەتە سروشتی و مرۆیەکانی ناوچەکە وەک تایبەتمەندی

ڕەگەزەکانی ئاووهەواو جۆری ڕووەکی سروشتی و ئاژەڵ و جۆری خاکەکەی جیاوازی لە پێکهاتەی سروشتی ناوچەکەلایەک و چالاکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و چۆنیەتی دابەش بوونی دانیشتوان لەلایەکی ترەوە

# باسی پێنجەم
## پەیوەندی نێوان زانستی جوگرافیاو بزاڤی گەشتوگوزار

لە ڕێگەی ناسینی چەمک و زاراوەکان شێوەو جۆری گەشت و گوزارەوە گەیشتنە، کە مانایەکی تەواوی گەشت و گوزارمان بۆ دەردەکەوێ ، واتا پەیوەندی نێوان گەشت و گوزارو جوگرافیامان بۆ دەردەکەوێ سەرەتا پێویستە بە کورتی جوگرافیا بناسێنین:-

(ریتشارد هاردتشۆرن)ی ئەمەریکی دەڵێت :( جوگرافیا لێکۆڵینەوە لە جیاوازییەکانی شوێن دەکات لە سەر ڕووی زەوی لەگەڵ دیاردەکانی) و زۆر لە جوگرافی ناسان واپێناسەی دەکەن کە ( جوگرافیا لێکۆڵینەوەیە لە پەیوەندیە ئاڵۆ گۆڕەکان لە نێوان مرۆڤ و ژینگەی سروشتی.لەم پێناسەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە جوگرافیا گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئەو ژینگەیەی تیایدا دەژی یان لە دەوروبەری مرۆڤەوە هەیە لەبەرئەوە جوگرافی ناسان گرنگیاندا بە گەشت و گوزار، چونکە گەشت و گوزار پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە ژینگەوە. جا ئەو ژینگەیە شارستانی بێت یا سروشتی چونکە لە ڕاکێشانی گەشتیار و تێرکردنی ئارەزووەکانی بە فاکتەرێکی گرنگ دادەنرێت، لەژێر ڕۆشنایی ئەو باسەدا دەتوانین چەند پەیوەندییەک لە نێوان جوگرافیاو گەشت و گوزار دیاری بکەین[١٧].

١- جوگرافیا گرنگی دەدات بە ژینگەی سروشتی و دیاردەکان و پەیوەندیە شوێنییەکان ، گەشت و گوزاریش گرنگی دەدات بە لایەنەکانی شوێنی وەک : ( پێگە گەشت و گوزاریەکان لێرەدا

پەیوەندی نێوانیان بەئاشکرا دەردەکەوێ، چونکە جوگرافیا توانای لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر کارلێکردنی شوێنی لە نێوان ناوچەکانی داواکاری و خستنەڕووی گەشت و گوزاری و دەرخستنی لەپێناو دەستەبەرکردنی هزرو ئارەزووەکانی گەشتیاران.[١٨]

٢- چالاکی گەشت و گوزاری پەیوەندی تەلارسازی و شێوەکانی بەکارهێنان و چاکسازی سەر ڕووی زەوییەوە هەیە بەم شێوەیە:-

أ- ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر زەوییەوە لە شێوەی ئاسانکاری گەشتوگوزاری وەک : ڕێگاوبان و ئوتێل و...هتد.

ب- هەوڵدان بۆ چاودێری پاراستنی ژینگەی سروشتی لە ڕێگەی دروستکردنی دامەزراندنی سەیرانگاو باخچەی نەتەوەیی.

٣-گەشت و گوزار ڕۆڵی گەورەی هەیە لەسەر گۆڕانکاری دابەشبوونی دانیشتوان و جوڵەی ئابوری و فراوانبوونی هەلی کارکردن و راکێشانی هێزی کار ، هەموو ئەو بابەتانە دەچنە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە جوگرافیەکان و لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی دابەشبوون و بزافی دانیشتوان.

٤- گەشت و گوزار بە یەکێک لە پیشە گرنگەکانی هەندێک لە سەنتەرە شارستانیەکان و ناوچە گەشت و گوزاری و هەوارگە و شارەدێرین و مێژوویی و ئایینیەکان دادەنرێت، جگە لە دامەزراندنی دامەزراوە خزمەتگوزاری و گەشتوگوزاری، کە کاردەکاتە سەر نرخی زەوی و شێوەی بەکارهێنانی و پیشەی دانیشتوان و تورەکانی گواستنەو ....هتد . هەموو ئەمانەش جێگەی گرنگی پێدانی جوگرافیان و دەچنە ناو لێکۆڵینەوەی جوگرافی.

٥- گەشت و گوزار ڕۆڵی هەیە لەبەرزکردنەوەی باری ئابوری و داهاتی تاکە کەس و دەستکەوتنی دراوی گرانبەها ، کە لەئەنجامی ئەمانەشدا دەبنە هۆی بەرزرکدنەوەی ئاستی بژێوی دابینکردنی خزمەتگوزارییە جۆراو جۆرەکان و تێکەڵاوبوون و ئاڵوگۆڕکردنی رۆشنبیری و داب و نەریت لە نێوان دانیشتوان و گەشتیاران دا، ئەمەش چ لەسەر ئاستی ناوخۆیی بێت یان دەرەکی ، کەڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر لایەنە شارستانییەکانی دانیشتوانی هەرێمەکەن لێکۆڵینەوە لەم لایەنە ناوەڕۆکی جوگرافی ناسانە.

## لیستی سەرچاوەکانی بەشی یەکەم:-

(١) شێروان عومەر رشید، بنەماکانی جوگرافیای سروشتی دروست بوون و گەشەپێدانی گەشتوگوزار لە پاریزگای سلیمانی، نامەی ماجستیر(بلاوکراوە)، پێشکەشی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلیمانی کراوە، بەشی جوگرافیا، ٢٠٠٦، لا٧.

(٢) د.ئازاد محمدامین نەقشبەندی، بایەخی گەشتوگوزاری سامانی ئاوی کوردستانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(١٢)، سالی سی یەم، ١٩٩٩، چاپخانەی وەزەرەتی پەروەردە،لا٥.

(٣) د. محمد صبحی عبدالحكيم و د.حمدی احمد الديب ، السياحه ( الظاهره ، المفهوم، الاهميه)، جغرافيه السياحه، الطبعه الثانيه ،مكتبه الانجلو المصريه ، ٢٠٠١، ص٣.

(٤) شێروان عومەر رشید، بنەماکانی جوگرافیای سروشتی دروست بوون و گەشەپێدانی گەشتوگوزار لەپارێزگای سلێمانی، سەرچاوەی پێشوو، لا٨

(٥) لوقمان وسو عومەر، توانستە جوگرافیە گەشتوگوزاریەکانی قەزای کۆیە، نامەی ماجستر( بڵاونەکراوە)، پێشکەشی کۆلیژی زانستە کۆمەڵایەتیەکان کراوە، لەزانکۆی کۆیە، بەشی جوگرافیا، ٢٠٠٦، لا١٧.

(٦) د.احمد حسن ابراهيم، جغرافيه السياحيه، دارالقلم، ٢٠٠٠، ص٢٦.

(٧) د.ئازاد معمدامين، المقومات الجغرافيهالطبيعيه لنشوو وتطور السياحه فى المنطقه الجبليه فى العراق، مقدمه فى الجغرافيه السياحيه مع دراسه التطبيقيه عن القطر العراقي، بغداد، ١٩٨٠، ص٨٤.

(٨) نفس المصدر، ص٨٥.

(٩) لوقمان وسو عومەر، توانستە جوگرافیە گەشتوگوزاریەکانی قەزای کۆیە، سەرچاوەی پێشوو لا٢٠.

(١٠) پرۆفیسۆر. د.ئازاد نەقشبەندی ،سەیران و گەشتوگوزار، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، کتێبی سەنتەری برایەتی سەرچاوەی پێشوو،لا٢٥٨-٢٦٠.
(١١) المؤسسه العامه للتعليم الفنى والتدريب المهنى، السياحه وماهيتها. سفر وسياحه ، جغرافيا السياحه والطيران، المملكه العربيه السعوديه،بدون المطبعه،بدون سنه ص٦.
(١٢) د.احمد حسن ابراهيم، الموقع الجغرافى، المصدرالسابق، ص٩٩.
(١٣) د.جەزا توفيق طالب ،الموقع الفلكى، النشاط السياحى فى اقليم كوردستان، المقومات الجيوبولتكيه الامن القومى فى الاقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجيه، سليمانيه، ٢٠٠٥ ،لا٢٥.
(١٤) د.ئازاد محمدامين، المقومات الجغرافيه الطبيعيه لنشوو وتطور السياحه فى المنطقه الجبليه فى العراق، المصدرالسابق، ص٨٤.
(١٥) ئاوێستا خالید محمد و هەوار تاهیر کەریم، شوێنی ئەسترۆنومی، ئەتڵەسی پارێزگای سلێمانی، چاپخانەی حمدی، سلێمانی،٢٠٠٤، لا ١٥.
(١٦) د.جەزا توفيق طالب، المقومات السياحيه فى اقليم، التنميه الريفيه والسياحيه فى اقليم كوردستان العراق، الطبعه الاولى، مطبعه رومان، سليمانيه، ٢٠٠٧،٣٣.ص٣.
(١٧) عصام حسن السعيدى، الدلاله والارشاد السياحى، الطبعه الاولى، عمان ، ٢٠٠٩.
(١٨) مصطفى يوسف كافى، اقتصاديات السياحه ، الطبعه الاولى، سوريا ، ٢٠٠٨.

# بەشی دووەم

## سیماو گیروگرفتی بزاڤی گەشتوگوزار و هەنگاوەکانی پلاندانان بۆ چۆنییەتی گەشەپێدانی لە هەرێمی کوردستان.

### باسی یەکەم :-

ئاستەکانی بەردەم بزاڤی گەشتوگوزار لە هەریمی کوردستان.

### باسی دووەم:-

شێوەکانی پلاندانان بۆ چۆنێتی گەشـەپێدانی گەشـت و گـوزار لە هەرێمی کوردستان.

تەوەرەی یەکەم/ رەگەزەکـــانی پەرەپێـــدانی گەشـــتوگوزار لەهەرێمی کوردستان:-

تەوەرەی دووەم/ لایەنەکانی پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەریمی کوردستان:-

تەوەرەی سێیەم/ ئامـانجە سـەرەکییەکانی پلانـدانان لەهەریمـی کوردستان:-

### باسی سێیەم:-

هەنگاوەکـانی چـۆنییەتی چارەسـەرکردنی بزاڤـی گەشـتوگوزار لەهەریمی کوردستان.

# باسی یەکەم

## ئاستەکانی بەردەم بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان:-

دابینکردن و پڕکردنەوەی خواست و ئارەزووی گەشتیاران کارێکی ساناو ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بەگرتنەبەری چەندین ڕێوشوێنی گونجاو و پلانی سەرکەوتووە، بەمەبەستی پەرەپێدان و پێشخستنی ئەم کەرتە گرنگە، کە لەلایەک لەگەڵ پێشکەوتنی خێرای ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەکنەلۆژییەکانی کۆمەڵگادا بگونجێت و لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ بنەماکانی خستنەڕووی گەشتیاری هەرێمەکە بگونجێت.

هەرچەندە لەهەرێمی کوردستان توانستە جوگرافیە سروشتیەکان و مرۆییەکان بوونیان هەیە بەڵام بەهۆی کۆمەڵێک گرفت و کۆسپەوە پێش نەکەوتووە بەدواکەوتووی ماوەتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی کەمی و شوێنی گەشتوگوزاری پێویست بۆ گەشتیاران بەبەراورد لەگەڵ توانستە بەدیکراوەکانی هەرێم، نەبوونی ئەم خزمەتگوزاریانەی لەگەڵ خواست و تواناکان و ئارەزووە گەشتوگوزاریەکانیاندا دەگونجێت، بەشێوەیەکی گشتی بەخوێندنەوەمان بۆ بارودۆخی راستەقینەی هەرێمی کوردستان بەگوێرەی ئەو راپۆرتە زانستی و لێدوانانەی کەپسپۆرانی ئەو بوارە دەیخەنەروو دەگەینە ئەو دەرەنجامانەی کەوا کەرتی گەشتوگوزار نەیتوانیوە لە گۆرەپانێکی بەرفراواندا کاروچالاکیە تایبەتیەکانی خۆی بخاتە گەڕوو و هەوڵ بدات کەرتی گەشتوگوزار بەشێوەیەکی دامەزراوەیی رووبکاتە

بەگەشتوگوزارکردنی شوێنەوارەکۆنەکان و مەزارگەئاینیەکان و گەشتوگوزاری زستانە، بۆیە بەبڕوای شارەزایان و پسپۆڕانی ئەم بوارە تاوەکو کەرتی گەشتوگوزار لەڕووی چەندایەتی و چۆنیایەتی پێش نەخرێت و نەبنە خاوەنی پڕۆژەی ستراتیژی گرنگ، ناتواندرێت کێبڕکێی گەشتوگوزاریی لەگەڵ وولاتانی دەوورووبەر بکەین، بۆیە لەسەرەتادا پێویستە ئەو رێگرو کۆسپانە دیاری بکەین. کە لەبەردەم پێشخستنی گەشتوگوزاری دایە لەهەرێمی کوردستان دواتریش گرنگترین ئەو پلان و هەنگاوانەی دەبنە مایەی چۆنیەتی گەشەپێدانی کەرتی گەشتیاری لەهەرێمەکە بخەینە روو[1].

گەشتوگوزار لەهەرێمدا بەدەست چەند گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرەوە نالاندویەتی ، پێویستە لێرەدا جیاوازی لەنێوان مەوداو سیماو سروشتی ئەو گیروگرفتانە بکەین ئەمەش بەهەڵاوێرکردنیان بۆ چەند ماوەیەکی کاتی چونکە دەست نیشانکردنی سروشت و هۆی گیروگرفتەکە بەگوێرەی پرۆسەی پلاندانانی زانستی بۆ پەرەپێدانی گەشتوگوزار بابەتێکی گرنگە، لەبەر ڕۆشنایی ئەمانەو پێشهاتەکانی دواڕۆژ دەتوانین ئەمانە بۆ چەند ماوەیەکی یەک لەدوای یەک بۆ دابەش بکەین و بارودۆخ و سروشتی هەر یەک لەگیروگرفتەکان دیار بکەین کەهەندێکیان سیمای هاوبەشیان لەنێوانیاندا هەیە[2] :-

١- بارودۆخی ئاسایشی هەرێم و ناجێگیری سیاسی بەتایبەتی لە سالانی ١٩٨٠-١٩٩٠ کە شەڕی عێراق و ئێران ماوەیەکی زۆری لێ برد، جگە لەزیادبوونی ژمارەیەکی پڕۆژەو کۆمەڵگەی

گەشتوگوزاری و دروست کردن و قیرتاوکردنی ریگای نوی (کەهەندیکیان بەئامانجی سەربازی دروستکرابوون) . ئارامی و ئاسایش کەدووبنەمای گرنگن لەرووی گەشتیارییەوە بەدریژایی ماوەی ناوبراو لەناوچەکەدا بوونەتە ئاستەنگ و بەربەست لەبەردەم چۆنیەتی و گەشەپیدانی گەشتوگوزار و وەهەروەها سنووری وولات لەبەردەم گەشتیارانی ناوخوو دەرەوە داخرابوون.

٢- کۆت و پیوەندی هەریمی و نیودەولەتی بەهۆی ئابلوقەی ئابووری و دان پیانەنان بەحکومەتی هەریم لەلایەن کۆمەلگای نیودەولەتییەوە. دابەزینی ئاستی داهاتی تاکەکەس کەبەشی پیداویستی رۆژانەی زۆربەیانی نەدەکرد ، ئەمەش گرفتیکی تربوو لەناوچەکەدا چونکە هاولاتیان لەو ماوەیەدا بیریان لەچالاکی گەشتوگوزاری نەدەکردەوە.

٣- بنیاتنانی پشت پیبەستراوی کەرتی گەشتوگوزار و خزمەتگوزارییەکان توشی تیکدان و تالان کردن هات کەهەندیکیان بەهۆی دووەم شەری کەنداو هەندیکی دیکەشیان لەسالانی یەکەمی کشانەوەی حوکمەتی ناوەند و دروست بوونی بۆشایی کارگیری پیش دروست بوونی حکومەتی هەریم روویدا.

٤- نەبوونی سیاسەتیکی روون و ئاشکرا لەلایەن حکومەتی هەریمەوە، سەبارەت بەگەشەپیکردن و وەبەرهینانی گەشتیاری و دەرنەکردنی یاسایەکی پەیوەندیداری لەبواری بەرهەمهینانی گەشتوگوزاریدا. جگە لەنەبوونی پلان کەگەران و لیکۆلینەوەکان بۆ دۆزینەوەی شوینی تر.بەپیی پیویست جێ بەجیی ناکات، بۆ ئەوەی

وا لەوەبەرهێنە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بکات.سەرمایەکانیان لەو بوارەدا بخەنەگەڕ.

٥- کەمی هەستی گەشتوگوزاری ناوخۆیی و نێودەوڵەتی و کەمی گرنگیدان بە گەشتوگوزار و ڕۆڵەکانی لەبواری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ژینگەیدا. بەهۆی قەدەغەکردنی گەشتی نێودەوڵەتی و ئەو هۆکارانەوەیە کەبەهەمان شێوە لەبەردەم گەشتی ناوخۆیشدا ڕێگربوون.

٦- نزمی ئاستی ڕێژەی توانای زانستی و شارەزایی ئەو کادر و کارگانەی لە بواری گەشتوگوزاردا کاردەکەن. جگە لە نەبوونی پەیوەندی زانستی پێویست و بەردەوام بۆ وەرگرتنی زانیاری و شارەزایی لەوولاتانی جیهان بەگشتی وولاتە گەشتوگوزارییەکان بەتایبەتی.کەئەمەش وادەکات ژمارەی گەشتیاران بەرەو ناوچە گەشتوگوزارییەکان بەرەو کەمی بچێت هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی خولی زانستی و دانەنانی دەرچووانی کۆلێژ و پەیمانگاکان لەگشت ناوچەگەشتوگوزارییەکان و هاوینەهەوارەکان.

٧- کەمی قەبارەی وەبەرهێنانی گەشتیاری.بەهۆی ئەو بارودۆخەی کەناوچەکە و هەرێم و عێراقی پیادا تێپەڕیووە. چونکە پەرەپێدان و گەشەکردنی گەشتوگوزار لەناوچەکەدا پێویستی بەسەرمایەی پێویست هەیە ، بەهۆی پێکهاتەی سروشتی و بەرزی و نزمی ناوچەکە و دواکەوتوویی ژێرخان و سەرخانی ئابووری.

٨- نەبوونی خاوەنی ماستەرپلانی گەشتوگوزاری و هۆشیاری و فەرهەنگی گەشتیاریمان لاوازە و خزمەتگوزارییەکانی کەرتەکەش لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە لەئاست پێویستدا نیە، تەنانەت چەندین شوێنەواری کۆن و بەسەدان ناوچەی سروشتی و مەزارگەی ئاینی هەیە کەنەتوانراوە بەگەشتوگوزاری بکەین.

٩- نەبوونی ئاسانکارییە گەشتوگوزارییەکان لەناوچەکەدا کەخۆی لە(ئوتێل و کافتریاو پارک و چێشتخانەو ...هتدد) دەبینێتەوە یەکێکن لەگرنگترین ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی کەڕووبەرووی کەرتی گەشتوگوزاری دەبێتەوە لەناوچەکەدا.

١٠- نەبوونی وێستگەیەکی کەشناسی لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا هۆکارێکە بۆ نەبونی زانیاری درووست بۆ دیاریکردنی ئاووهەوای گەشتیاری لەسەر چالاکییە جۆربەجۆرەکانی گەشتوگوزار.

١١- ناوچەی لێکۆڵینەوە چەندین ڕێگای هاتووچۆی تێدا بەدی دەکرێت کەخزمەت گوزاری جۆراوجۆر پێشکەش بەناوچە جیاوازەکان دەکات، بەڵام هەڵسەنگاندنی چەندیەتی و چۆنیەتی و چالاکی ئەم ڕێگایانە بۆ پەرەپێدان و گەشەکردنی گەشتوگوزار بە شێوەیەی ئێستا خزمەتگوزاری تەواو پێشکەش بەکەرتی گەشتوگوزاری ناکات.

١٢- کەمی و نەبوونی شوێنی حەوانەوە، ئەمە بەگرنگترین ڕەگەزەکانی خزمەتگوزاری دادەندرێت چونکە گەشتیار لەگەڵ گەیشتنی بۆ هەر ناوچەیەکی گەشتیاری بیر لەجێگای حەوانەوە دەکاتەوە، لەناوچەی لێکۆڵینەوەکەدا بەئاشکرا هەست بەنەبوونی

شوێنی حەوانەوە دەکرێت، وەهەروەها کەمی شوێنی حەوانەوەش دەبێتە هۆی کەمی مانەوەی گەشتیاران لەگەشتەکەیاندا.

١٣- نەبوونی پڕوپاگەندەو نەخشەو ڕێبەری گەشتیاری لە ناوچەی لێکۆڵینەوەکەدا بە هۆی نەبوونی دەزگای ڕاگەیاندنی تایبەت بە گەشت و گوزارو و کادیری شارەزا لەم بوارەدا ، کە ئەمەش بۆتە هۆی کەمی زانیاری لە سەر ناوچە گەشت و گوزاریەکان.

١٤- نەبوونی شوێنی تایبەت بە وەستانی ئۆتۆمبیلەکانی گەشتیاران لە ناوچەکەدا وەک ( پارک ) کە چاودێری ئۆتۆمبیلەکان بکرێ لە لایەن لیژنەیەکی تایبەتیەوە .

١٥- کەمی و نەبوونی چێشتخانەو ئوتێلی گەشتیاری و کافتریای مۆدێرن بۆ کات بە سەر بردن و خۆشگوزەرانی لە ناوچە گەشت و گوزاریەکەداو لە گەڵ نەبوونی شوێنی یاری تایبەت بە منالان (شاری یاری ) و بنکەی تەندروستی و چەندین ئاسانکاری گەشت و گوزاری تر لە ناوچەکەدا.

١٦- نەبونی هاوسەنگی نێوان ژینگەی ناوچەکەو چالاکی گەشت و گوزاریەکان بە هۆی زیاد بوونی ژمارەی گەشتیاران بەبێ ڕەچاوکردنی توانای ناوچەکە ، ئەمە بەتایبەت لە وەرزی بە هاردا کە سەرەتای وەرزی چالاکییە گەشت و گوزاریەکانە لەڕێکخستن و گرینگی نەدان بە ژینگەی ناوچەکە لە لایەکی تر.

١٧- نەبونی ژێرخانی ئابووری پێشکەوتوو ، تا بتوانێ پێداویستیەکانی گەشتیاران بە پێی پێویست پڕبکاتەوە ، وەک هەبوونی کارەباو گەیاندنی بە ناوچە گەشت و گوزاریەکان بە شێوەیەکی هەمیشەیی بەردەوام.

١٨- نەبـــوونی هەســـتێکی نەتەوایەتـــی لەلایەن دامودەزگـــا بەرپرســـــــــەکان و ئەو کەســـــــــانەی کەوا داهـــــاتی گەشـتوگوزاری کـۆدەکەنەوە لەسـەر کەرتـی گەشـتوگوزاری .بـۆ ئەوەی ئەو داهـاتە بخـرێتە گەڕ بـۆ پەرەوپـێش چـوونی نـاوچە گەشتوگوزارییەکان.

١٩- بـوونی بازگەکـان لە شـارو شـارۆچکەکان و خـاڵە سنوورییە هاوبەشیەکانی وولاتان . یەکێکی ترە لە سیماو گرفتەکانی بەردەم کەرتی گەشتیاری.ئەویش بەهۆی زۆرهێنانە خوارەوەی گەشتیاران لەبازگەکـان ، جـگە لەمـانەش چەنـدین ئاسـتەنگی تـر هەن وەک (پاکوخاوێنی و نەبوونی پلان و بووجەی تـایبەت و شـێوازی کـۆن و بەڕێوەبردن).

٢٠- کەرتـــی گەشـــتوگوزار لەهەرێمـــی کوردســـتان نەتـــوانراوە لەچوارچێوەیەکی بەرفراواندا کـاری بـۆ بکرێت و هـانی گەشـتیاران بدەن کە بەردەوام ڕوو لەناوچەکە بکەن، تەنانەت نەتوانراوە پەرە بەگەشتوگوزارکردنی ناوچە شوێنەوارەکان و کلتووری تەرفیهی و وەرزشـی و گەشـتوگوزاری زسـتانە بـدرێت و تەنیـا گەشـتیار لەبازنەی داخراوی گەشتوگوزاری هاوینە ماوەتەوە.

# باسی دووەم

## شێوەکانی پلاندانان بۆ چۆنێتی گەشەپێدانی گەشتو گوزار لە هەرێمی کوردستان:-

لەهەرێمی کوردستان سەرەڕای ئەو هەموو باس و تیڕوانینە جۆراوجۆرەی کەباس لەکەرتی گەشتوگوزار دەکات، لەناو حکومەت و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەنووسان و مامۆستایانی ئەکادیمی بەدەیان ووتارو ڕاپۆرت ڕومالکراوە، ئاماژەیەکە بەبوونی ژینگەی وەبەرهێنان، ئەگەر بێتوو بەباشی سوودی لێوەربگیرێت و لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەو تەقلیدیانەی ئێستا دەربهێندرێت و، بخرێتە ناو چوارچێوەی کاری وەبەرهێن و خاوەن کارانەوە، کەچی تاوەکو ئێستا بەپێی پێویست نەتواندراوە بەشێوەیەکی زانستی و پراکتیکی سوود لەم کەرتە گرنگە ئابووریەوە وەربگیرێت، بەهاوشێوەی وولاتانی تری جیهان کە گەشتوگوزاری ببێتە داهاتێکی نەتەوەیی گرنگ و رۆڵی لەپەرەپێدانی ئابووری و کۆمەلایەتی هەرێمەکەمان هەبێت[٣].

پلان دانان بەشێوەیەکی گشتی بیرکردنەوە و بڕیاردانی ڕێک و پێکە سەبارەت بەهەڵبژاردنی ڕێڕەوێکی دیاریکراو بۆ پاشەڕۆژو لەنێوان ئەو جێگرەوە جیاوازو بوارانەی کەهەن، یەکێکیشە لەو ئەرک و کارگێڕیانەی کەبۆ وەدەستهێنانی ئامانجی دیاریکراوە و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان ئەنجام ئەدرێت، ئەو پرۆسەیە زانیاری تەواو ووردی دەربارەی واقیعی هەر گیروگرفتێک

پێویستە، جگە لەهەر پێشهاتێکی داهاتوو، ئەوەی کۆسپیش دەخاتە بەردەم ئەم پرۆسەیە ئەو گۆرانکارییە خێرایانەیە کەلەدەوروبەری شوێنی کارکردن ڕوودەدەن ، وەکو گۆرانکاریە ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و تەکنەلۆژییەکان، بەلام مانای پەرەپێدانی ئابووری لەکەرتێکی دیاریکراودا پەیوەستەبە پرۆسەی وەگەڕخستنی هێزی پەیوەندیدار لەماوەیەکی درێژدا، بەئامانجی ڕودانی گۆرانکاری بەرەو ژوور لەداهاتی نەتەوەیی کەلەتێکڕای زیادەی دانیشتوان زیاتربێت. ئەمەش دەبێتە بەرزبوونەوەی بەشی تاک لەداهات. ئەمەش بەهۆی گۆرانکارییە گونجاوەکان لەقەوارەی بەرهەم چوارچێوەی ڕێکخستن و خستنەڕوو و خواستی هۆکارەکانی بەرهەمەوە ئەنجام دەدرێت.ئێستا دەتوانین بڵێین .پلان دانان بۆ پەرەپێدانی گەشتوگوزار تەعبیر لەچالاکیەکانی ئابووری و کارگێری دەکات کەبەدوای ئامانجێک دەگەڕێت،ئەو مانایەی کەبۆی چووین تارادەیەکی زۆر لەگەڵ مانای پلاندانانی گەشتوگوزار (فرید لارسن) ەوە،دەگونجێت کەدەڵێت:( پرۆسەیەکە بریتی یە لەبەکارخستنی هەموو سەرچاوە سروشتی و مرۆیی و مادییەکانی پەیوەندیدار بەگەشتوگوزار تا ئەوپەڕی سوود بەنەتەوە بگەیەنێت)[٤].

**تەوەرەی یەکەم/ رِەگەزەکانی پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان:-**

بە گــویرەی ئەو بنەمایــانەی کە لە پێشــتردا ئاماژەمــان بــۆ کــردووە، دەتوانــدرێت چەنــدین شــوێن و نــاوچەی گەشــتیاری لە ناوچەی گەشت و گوزارییەکانی هەرێمی کوردستان بخەینە ڕوو کە خاوەنی توانستێکی گەورەو هەمە جۆری سروشتین ، شان بە شــانی نــاوچە گەشــت و گوزاریەکــانی تــرە ئەگەر خزمەتگــوزاری لەڕووی پلانــدانانەوە بــۆ تەرخــان بکرێــت ، پلانــدانان بــۆ نــاوچە گەشت و گوزاریەکان لە دووە لاوە خۆی دەبینێتەوە بە تایبەتی لە ڕووی خستنە ڕووی گەشیاری یەوە لە لایەک فاکتەری جوگرافی، لەلایەکی ترەوە ئاسانکاری و خزمەتگوزاریە گەشت و گوزاریەکان بە تەواو کــارو بنــاغەی ســەرهەڵدان و پەرەپێــدانی گەشــتیاری دادەنرێــت، لێــرە ئەتوانــدرێت گرنگتــرین رەگەزەکــانی پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان بخەینە ڕوو کەبریتین لە(٥):-

١- رەگەزەکانی راکێشــانی ســەرنجی گەشــتیاران(Attraction) کە ڕەگەزە سروشتییەکان لەخۆ ئەگرێت (natural features) وەکو ( شێوەکانی سەر ڕووی زەوی و ئاووهەواو ژیان و ئاژەڵی کێویی و دارســــتانەکان) .لەگەڵ بــوونی ڕەگەزەکــانی مرۆیــی (man-made-objects) کەهەریەکە لە ( مۆزەخانەو پێگەو شوێنەوارو ناوچە مێژووییەکان و مەزارگە ئاینییەکان) ئەگرێتەوە.

٢- گواســتنەوە (Transport) بەهەمــوو جــۆرە جیاوازیەکــانییەوە کەبریتین لە ( ئاسمانی و ئاوی و وشکانی).

٣- شوێنی حەوانەوەو پشوو (Accommodation) لەگەڵ بوونی ناوەندێکی بازرگانی ( commercial center) کە هەریەکە لە خزمەتگوزارییەکانی هوتێل و موتێل و شوێنی تایبەت بە نوستن و پشوو وەک (خانووی میوانداری و بەکریگرتنی شووقەو کابینەو خانووی دووەم (second home).

٤- پاڵپشتیکردنی ئاسانکارییە گەشتوگوزارییەکان ( supporting facilities) لەگەڵ کۆی گشتی جۆرەکانی وەک راگەیاندنی گەشتیاری و بەڕێوبەرایەتی گەشتیاری و سەنتەری پەرەپێدان و ئاوەدانکردنەوەو کردنەوەی بانک و خزمەتگوزارییەکانی تر.

٥- خزمەتگوزاری ژێرخانی ئابووری(infrastructure) کە هەریەکە لەبوارەکانی (ئاوو کارەبا و تۆرەکانی پەیوەندیکردن) دەگرێتەوە.

**تەوەرەی دووەم/ لایەنەکانی پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان:-**

دەتوانین لایەنەکانی پەرەپێدانی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان لەم بوارانەدا بخەینە ڕوو(٦):-

١- لەبواری ئابووری:-

أ- باشترکردنی باری تەرازووی پارەدان.

ب- باشترکردن و پەرەپێدانی هەرێمی بەتایبەتی لەڕوانگەی دابینکردنی هەلی کاری نوێ بۆ ناوچە گوندنشینەکان.

ج- باشتربوونی هەمەلایەنەی خزمەتگوزاری ژێرخانی ئابووری.

چ – دابینکردنی هەلی کاری نوێ.

٥- زیادبوونی دەسکەوتی دەوڵەت لەبواری باجدا.

٢- لەبواری کۆمەلایەتی:-
أ- زۆربوونی ئاسانکارییە خۆشگوزەرانییەکان و خۆشحالی دانیشتوانی ناوخۆ.
ب- پاراستنی حەزوو ئارەزوو و تێرکردنی تاک وەک بوونەوەرێکی کۆمەلایەتی لەکۆمەلگادا.
٣- لەبواری ژینگەیی:-
أ- پاراستنی ژینگەو وەرێگرتن لە تێکدانی جوانییەکەی.وەهەروەها گرتنەبەری رێ و شوێنی توند بۆ ئەوانەی سەرپێچی لەو بوارەدا ئەکەن.
٤- لەبواری سیاسی و رۆشنبیری:-
أ- بلاوبوونەوەی رۆشنبیری و زیادبوونی تێکەلاوی کلتوورەکان و بەیەکگەیشتنی گەلان.
ب- پەرەسەندنی پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان حکومەت لەناو دەولەتە گەشتیارەکاندا.

**تەوەرەی سێیەم/ ئامانجە سەرەکییەکانی پلاندانان لەهەرێمی کوردستان:-**

لێرەدا ئەتواندرێت بۆ بەرەو پێشبردنی بزاڤی گەشتیاری لەرێگەی پەیرەوکردنی پلانێکی گونجاوو هەمەلایەنە کە خوێندنەوەی تەواوی بوارەکانی گەشتوگوزار بکات لەهەرێمی کوردستان ئەم چەند پلانە پەیرەوبکرێت بۆ زیاتر بەرەو پێش چوونی کەرتی گەشتیاری کەئەوانیش بریتین لە:-
**یەکەم : پلانی هەنووکەیی**:- کە بۆ وەرزی گەشتیاری ئەم سال چی بکرێت ؟

**دووەم : پلانی کورتخایەن**:- کەماوەکەی (١- ٥) سالی داهاتوو چی بکرێت ؟ بە رنامەی بۆ دابنرێت و کاری لە سەر بکرێت.

**سێ یەم : پلانی درێژ خایەن** :- کەماوەکەی لە ( ٥ ) سال زیاتر لە خۆبگرێت.

بۆ ئەوەی گەشتوگوزار خۆشگوزەرانی و سەقامگیری لەگەل خۆیدا بێنێت، چەند کارێکی دیاریکراو هەیە دەبێت لەلایەن سێ پێکهاتەوە جێ بەجێ بکرێت (کۆمەلگا،حکومەت، کۆمپانیا دەرەکیەکان) .وەیان ماستەر پلانی گەشتوگوزاریش دابندرێت و بەشێوەیەکی خێرا دەست بەجێ بەجێکردنی بکرێت، وەکۆمەلگا پێویستە کێبڕکی زیاد بکات،چاکسازی لەخزمەتگوزارییەکاندا بکات، هەروەها ژینگەو کەلتووری خۆی بپارێزێت، حکومەتیش پێویستە ستراتیژیەتی بەهێز دابنێت، یاسای پێویست و رێکوپێک دەربکات، ئاستەنگ و بەربەستەکانی بەردەم پێشکەوتنی هەلبگرێت، هەروەها ستاندارە نێودەولەتیەکان لەبواری گەشتوگوزاریدا پەیرەوبکات ،کۆمپانیا دەرەکیەکانیش پێویستە کەرتی گەشتوگوزار بەدامەزراوەیی و بەتایبەتکردن بکەن وەکو هێزێکی سەرکەوتووی ئابووری وەبەرهێنان لەم کەرتەدا بکەن، هەروەها زانیاری بەسوود بدەن و ئاسانکاری تەکنەلۆژی لەم بوارەدا بکەن و ناساندنی بنەماگەشتوگوزاریەکانی هەرێمی کوردستان ئەویش لەرێگەی فلیمی دیکۆمینتاری و نوسینی بابەتی ئەکادیمی و زانستی و کۆنفرانس و کۆبوونەوە(٧).

لێرەدا گرنگترین ئامانج و سودەکانی سەرەکیەکانی پلاندانان لەهەرێمی کوردستان دەستنیشان دەکەین کەبریتین لە(٨):-

١- دیاریکردنی ئامانجی بوژانەوەی گەشتیاری کورت خایەن و دریژخایەن، هەروەها دیاریکردنی رامیاری گەشتیاری و دانانی رێ و شوینی گونجاو بۆ جی بەجیکردنی ئامانجەکان.

٢- ریکخستنی گەشە گەشتیارییە هەرەمەکیەکان..

٣- هاندانی کەرتی گشتی و تایبەت بۆ وەبەرهانین لەبواری ئاسانکارییەگەشتیارییەکان لەهەر ناوچەیەک

٤- زیادکردنی سوودە ئابووری و کۆمەلایەتیەکانی چالاکیە گەشتیارییەکان و کەمکردنەوەی تێچوونی وەبەرهانین و بەریوەبردن بۆ کەمترین رادە.

٥- پاریزگاری کردن لەخراپبوونی دەرامەتە گەشتیاریەکان (توانستی سروشتی و مرۆیی).

٦-دەرکردنی بریاری پێویست وە جێ بەجێکردنی بەکارهێنانی گونجاو لەناوچە گەشتیاریەکان.

٧- رێکخستنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان .

٨- پاریزگاری کردن لەژینگە لەرێگەی دانان و جێبەجێکردنی پلانی گونجاو .

٩-فەراهامکردنی حەواڵەکردن (تمویل) لەناوخۆو دەرەوە بۆ کردارەکانی گەشەکردنی گەشتیاری.

١٠- رێکخستنی چالاکیە گەشتیارییەکان لەگەڵ چالاکییە ئابوورییەکانی تر بەشێوەیەکی تەواوکاری.

## باسی سێیەم:-
## هەنگاوەکانی چۆنییەتی چارەسەرکردنی بزاڤی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان.

گەشتوگوزار دیاردەیەکی جوگرافیە پەیوەستە بەژینگەی سروشتی و بنیاتنانی ئابووری و جوولەی مرۆڤەکان، هەوەکو پیشەسازی پێویستی بەپلانداانان و جێ بەجێ کردنەوە هەیە، چونکە گەشەپێدان و گرنگی دان بەم کەرتە لەهەر هەرێم و ناوچەیەکی جیهانیدا بنەمایەکی گرنگی بەرزبوونەوەی گەشەی ئابووری هەرێم و ناوچەکەیە، کەبەرپرسە لەپلانی پەرەپێدانی پێشکەوتنی ئابووری. کەدەورێکی گرنگ دەگێردرێت لەبەرهەمهێنانی سەرمایەو زیادبوونی داهاتی نەتەوەیی وەپاڵپشتی تەرازووی پارەدانان دەکات، کەبەژدارە وەک کەرتەکانی تری چالاکی ئابووری لەداهاتی نەتەوەیی لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەش گەشتوگوزار و پەرەپێدانی دەبێتەهۆی باشکردنی ژینگەو پشوودانی جەستەیی و دەروونی گەشتیاران.کەبێگومان ئەمەش لایەنێکی گرنگە کەبەژداری دەکات لەپاڵپشت کردنی دەرخستنی رووەکان(٩).

### أ- لەڕوانگەی [ڕاگەیاندنەوە]:-

ڕاگەیاندن دەژمێردرێ بە ڕێگەیەکی بنەڕەتی بۆ کاری بازاڕ گەرم کردن و یان خزمەتگوزارییەکان ریکلامو ڕاگەیاندن ئەمانەن(١٠):-

١ هەبوونی بەرنامەیەکی هەفتانە لە تەلەفیزیۆنە ناوخۆییەکان بە ناوی ( بەرنامەی گەشت و گوزار ) کە رۆڵی سەرەکی بگێڕێت بۆ هاندانی گەشتیار کە ئارەزووی گەشتوگوزار بکەن، هەروەها رۆڵی هەبێ لە هوشیار کردنەوەی رۆشنبیری گەشتیاران.

٢- گرنگی دانی زیاتر بە بواری گەشتوگوزار لە لایەن هۆکارەکانی راگەیاندنەوە.

٣- هاوکاری کردنی زیاتر هەبێت لە نێوان وەزارەتی گەشتوگوزارە و وەزارەتی راگەیاندن بۆ بەخش کردنی بەرنامەی تایبەت بە گەشت و گوزار و شوێنە گەشتیارەکان.

٤- چڕکردنەوەی هەڵمەتەکانی ڕاگەیاندن لەو وەرزانەی کە جموجۆڵی گەشت چالاکە وەک بەهارو هاوین.

٥- بابەتی گەشت و گوزار وەک وانە لە قۆناغە جیا جیاکانی خوێندن بخوێندرێت .

٦- دەرچوونی چاپەمەنی و گۆڤارو رێبەری گەشتیاری تایبەت بە ناساندنی توانستە سروشتی و مرۆییەکانی ناوچە گەشتوگوزارییەکان.

**ب- لەڕوانگەی [ژینگەو سەوزکردن و جوانکردن][11]:-**

**١- پێویستە زیاتر گرنگی بە سەوزکردنی ناوچە گەشتوگوزارییەکان بدرێ لەرێگەی دابینکردنی نەمام و رووەکی هەمیشە سەوز بەهاوکاری لایەنە حکومی و ئەهلیەکانی تایبەت بە بەڕێوەبەرایەتیەکانی شارەوانی و کشتوکاڵ و ئاو، چونکە ئەم ناوچە گەشتیارەکانی هەرێم گرنگیەکی زۆریان هەیە ئەویش لە ڕێگەی سەوزکردنی زیاتری هەرێمەکەو و زیاتر بایەخدان بە**

بواری خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوانی ناوخۆو دەرەوە لەروانگەی گەشتوگوزارییەوە.

٢- پێویستە ناوچە خۆشگوزەرانیەکان بەتایبەتی سەنتەری شارەکان زیاتر پەرەیان پی بدرێ ئەویش لە ڕووی دابینکردنی پێداویستیەکان بۆ ئەو ناوچانە ،چونکە زۆربەی ئەو ناوچانە بێبەشن لە خزمەتگوزاری(شوێنی یاری،کافتریا،شوێنی دانیشتن...هتد) بۆ ئەوەی ببنە شوێنێکی گرنگ بۆ پشوودانی جەستەیی و دەروونی گەشتیاران لە بەرێ کردنی کاتەکانی دەست بەتاڵیان لەرۆژانی پشووەکاندا..

٣-دەبێت لەکاتی دامەزراندنی هەر پڕۆژەیەکی خزمەتگوزاری ڕەچاوی ژمارەی دانیشتوان و قەبارەی ناوچەکە و دابینکردنی شوێنێکی گونجاو بۆ پشوودانی هاوڵاتیان لەبەرچاو بگیرێت.

٤-پێویستە دابەشبونی ناوچە سەوزاییەکان بە شێوەیەکی ئەندازەی بێت نەوەک هەرەمەکی بێت.

٥- نەهێشتنی ئەو کارو دیاردە ناشارستانیانەی کەدەبنە هۆی نەمانی روپۆشی ڕووەکی و سەوزایی و سەرچاوە سروشتیەکان بەتایبەتی لەناوچە دەشتاییەکان و ناوچە شاخاوییەکان وەک (داربڕین و سووتان و لەوەراندن و تێکدان و ....... هتدد) کەسەرەنجام دەبێتەهۆی لەدەستدانی سروشتی گەشتیاری ناوچەکان.

٦- نەهێشتنی دیاردەی پیس بوونی ژینگەی ناوچە گەشتوگوزاریەکان و شوێنە گشتیەکان.ئەویش لەرێگەی دابینکردنی شوێنی تایبەت بە فرێدانی پاشەڕۆ و کۆکردنەوەیان لەشوێنێکی

تایبەت و دروستکردنی WC وشوێنی یاری بۆ منداڵ و شوێنی تایبەت بە دروستکردنی ئاوی خواردنەوە بەهاوکاری شارەوانی و لایەنی تەندروستی.

**ت- لەڕوانگەی [ماستەرپلان] بۆ ناوچە گەشتوگوزارییەکان(١٢):-**

١- نابێت گەشەی شارنشینی لەسەر حسابی کەمبوونەوەی رووبەری ناوچە گەشتوگوزارییەکان رووبدات. ئاشکرایە گەشتوگوزار بەبنەمایەکی گرنگی داهاتی ئابووری شارەکان دادەندرێت. لەدەستدان و کەمبوونەوەی رێژەی ناوچە گەشتوگوزارییەکان ئەرکێکی ئابووری قورسی خستۆتە سەر ئاسایشی نیشتیمانی و توانای ناوچەکە و کەبوونەوەی دەستی کار لەبواری گەشتیاریدا.

٢- نابێت فراوان بوونی ناوچە گەشتوگوزارییەکان بەشێوەیەکی بێ بەرنامەیی و نەبوونی پلانێکی ستراتیجی(ماستەرپلان) بێت.وەهەروەها شیاوو گونجاو نیە کە گەشە و ئاراستەی گەشتیاری و گەشەکردنیان لەسەر حسابی زەویە کشتوکاڵییەکانی ناوچەی شارەکان بێت، یەکێکە لەو کێشە و گیروگرفتانەی کە رووی لەچالاکی ئابووری بەتایبەتی کەرتی گەشتیاری کردووە و زۆرترین گورزی ئابووری وەشاندووە لەکۆمەڵگای ئەمڕۆماندا.

٣-بەرزبوونەوە و کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لە ناوچە گەشتوگوزارییەکان گرفتی زۆری لێدەکەوێتەوە لەروانگەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی، بۆیە پێویستە توانای ناوچە

گەشتوگوزارییەکان بەبەراورد لەگەڵ هاتنی ژمارەیەکی زۆری گەشتیاران لەبۆنەو یادە کۆمەڵایەتی و ئاینییەکان لەبەرچاو بگیرێت .

**پ- لەڕوانگەی [دامودەزگا] ی تایبەت بە گەشتوگوزارییەکان[١٢]:-**

١- کردنەوەی کۆلێژو پەیمانگای تایبەت بە گەشتوگوزار بۆدابینکردنی کادیری پێشکەوتوو و شارەوا لەکاروباری میوانخانەو پێشوازی و مامەڵەکردن و رێکخەری گەشتی گەشتیاری.

٢-گرنگی دان بەکردنەوەی خولی کۆرسی زمانەکان بۆ کادیران و شارەزایانی گەشتیاری لە میوانخانەو هوتێل و ناوچە گەشتیارەکان. بەمەبەستی ئەوەی کاتێک گەشتیار روو ئەکاتە ناوچە گەشتوگوزارییەکات گرفتی زمانی بۆ دروست نەبیت.

٣- کردنەوەی بانکی ناوەندی و گۆرینەوەی دراو بۆ گەشتیارانی دەرەوە. بۆ ئەوەی بەئاسانی پارەکەی خۆیان لەناوچەکەدا بگۆرنەوە.یاخود دارشتنی ئەو یاسایانەی کەهانی پارەدارە بیانیەکان دەدات تاکەرتی گەشتوگوزار وەگەربخەن و پێویستە دەستبەرداری پاراستنیان بکرێت.

٤- ئاسانکردنی کاروباری گەشتیاران بەتایبەتی لەپاشکۆی کونسوڵخانەکان بەمەبەستی یارمەتی دانی گەشتیارانی دەرەوەو پێدانی ڤیزە پێیان.

٥- دابین کردنی سەقامکیری بارووردۆخی ئەمنی و ئاسایش، چونکە وەکو ئاشکرایە بارودۆخی ئاسایش و ناجیگیری سیاسی

لەلایەک و دواکەووتووی هۆشیاری گەشتوگوزاری لەلایەکی ترەوە فاکتەرێکی کاریگەرن لەبەردەم پێشکەوتن و پەرەپێدانی بزاڤی گەشتوگوزار لەهەر ناوچەیەکدا.

٦-دەرکردنی چەند یاسایەکی تایبەت بە کەرتی گەشتوگوزارو چۆنیەتی ڕێک خستنی و پەرەپێدانیان لەلایەن حکومەت و پەرلەمانەوە .بەمەبەستی گەشەکردنیان.

## ج- لەڕوانگەی [خزمەتگوزاری بنەڕەتی][١٤]:-

١-بنیاتنانی دام و دەزگا گەشتوگوزارییەکان وەک (هوتێل و سەیرانگاو هاوینەهەوار و بازاڕو شوێنی کات بەسەربردن و شوێنی یاری منالان و شوێنی مەلەوانی و پارکی وەستانی ئۆتۆمبێل).

٢-دابینکردنی ئاسانکارییە گەشتوگوزارییەکان کە راستەوخۆ و ناراستەوخۆ سوودیان لێوەربگیرێت وەک (ڕاکێشانی تۆڕەکانی کارەباو ئاوو و ڕێگای هاتووچۆو دەزگاکانی پەیوەندی و نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی).

٣- فراوانکردنی ناوچە گەشتوگوزارییەکان بەمەبەستی خستنەڕووی پیشەی فۆلکلۆری و کلتووری و پیشە دەستیەکانی ناوچەکانی هەرێم.

٤- چاککردنی ڕێگاوبانەکانی ناوچە گەشتیارەکان بەشێوەیەک گەشتیار هەست بەپشووی جەستەیی و دەروونی بکەن.بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە هێماو نیشانەی هاتووچۆ لەسەر ڕێگاکان

دابندریت بۆ رێنمایکردنی گەشتیاران بۆ شوێن و دامەزراوە گەشتوگوزارییەکان.

٥- گرنگی دان بەپێشخستنی خزمەتگوزارییەکانی وەک( تەلەفۆن و پۆستەو رێبەری گەشتیاری و دروستکردنی چەندین بنکەی تەندروستی) بۆ رووداوی کتوپڕ بەتایبەتی لەناوچە گەشتوگوزارییەکان بەتایبەتی لە قەزاو ناحیەکان.

٦- بایەخ دان بەدروستکردن و پەرەپێدانی شوێنی تایبەت بەکات بەسەربردن وەک (یاریگای وەرزشی و هاندان و گرنگی دان بە وەرزشی ئاوی و بەلەم و راوەماسی و هەڵخلیسکان لەسەر بەفرو دروستکردنی تەلەفریک و سینەماو هۆڵی شوێنی کۆبوونەوە)

٧- پێویستە بایەخ بەخزمەتگوزارییە گەشتوگوزارییەمیللیە ناخۆییەکان و کلتوورییەکان بدرێت ئەمەش لەرێگەی سازکردنی خێوەتگاو ماڵی لاوان و کەمپ و سازدانی چەندین میهرەجانی میللی و هۆڵی کۆبوونەوەو مزگەوت و شاری یاری و باخچەی ئاژەلان و گرنگی دان بەشوێنەوارە دیرینیەکان و شوێنەوارە ئاینییەکان و دروستکردنی پاریزراوی سروشتی.

٨- دامەزراندنی چەندین ویستگەی کەشناسی سەرەکی و ناوەندی بەمەبەستی لیکۆڵینەوەی ووردترو راستر لەسەر کاریگەری رەگەزە جیاوازەکانی ئاووهەوا لەسەر چالاکی گەشتوگوزار بەپێی ناوچە بەرزاییەکان و دیاریکردنی رۆژی گەشتکردن.

## خ- لەڕوانگەی [هۆشیاری گەشتیاری][15]:-

١- پێشـوازیکردنی گەشـتیاران بە ئەتەکیـت و رۆشـنبیری و بەشێوازو رەفتارێکی جوان و گونجاو لەلایەن کادیرانی گەشتیاری راهێنـراو، وە چـۆنیەتی مامەڵەکردنیـان بەگـوێرەی حەزو خولیا و ئارەزوویان.

٢- ئاراسـتەکردن و چـاودێری کردنـی هاوڵاتیـانی گەشـتیار بۆ پاراستنی ژینگەو ئاشتی پاک و خاوێنی ناوچە گەشتوگوزارییەکان.

٣- پاراستنی کەلەپووری نیشتیمانی لەڕوبەڕووبوونەوە لە دزین و ویران بوون و لەناوچوونیان.

٤- رۆشنبیرکردنی هاوڵاتیـان بە هەڵمەتـی راگەیانـدن بـۆ گرنگی و بـایەخی گەشـتوگوزار لەڕوانـگەی ئـابووری و کـۆمەڵایەتی و شارستانی و ژینگەیی و تەندروستی و سیاسی و ..........هتد.

## ح- لەڕوانگەی [ئاسانکاریی میوانخانەکان][16]:-

١- دابینکردنـی هوتێـل و پێشکەشـکردنی خـواردن و خـواردنەوە تێیدا، لەگەڵ بوونی شـوێنی تـایبەت بە پشـوو بۆ هەمـوو کاتێکی تایبەت بەگەشتیاران.

٢- دابینکردنـی هـوتێلی سـەر رێگاکـان (موتێـل) بـۆ نـاوچە گەشـتوگوزارییەکان.هەروەها پێشکەشـکردنی خزمەتگـوزاری بەردەوام وەک دابینکردنی شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل (پارک) و وە پڕکـردنەوەی خواسـتی گەشـتیاران لە میوانخانەکـانی تـایبەت بەگەشتیاران.

٣- دابینکردنی چەند (کابینەیەک) یان چەند یەکەیەکی بچووکی (نشینگە) یان (خانووی دووەم second home) بەشێوەیەکی بەردەوام .کەتێدا خزمەتگوزاری وەک شوێنی خواردن و خواردنەوەو ئاسانکاری شوێنی نوستنی تێدا بەرجەستە بێت.

٤- دابینکردنی چەندین هۆڵ و سەنتەری کۆبوونەوەبۆ (ۆرک شۆپ و سیمینارو ئاهەنگ گێران) وە مۆڵەتپێدانیان، لەناوچە گەشتوگوزارییەکان لەگەڵ بوونی داهێنراوە تازەکان. لەگەڵ بوونی هۆڵی سینەماو مەلەوانی و پشوو و یاری و ژووری تایبەت بەنووستن و خێزان .........هتدد.

د- دابینکردن و دروستکردنی چەندین باڵەخانەو و ڤیلا و هۆڵ کە تێدا شوێنی میوانداری کاتی لە خۆ بگرێت بۆ هاتنی ئەو وەفدو گروپە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی کە بەرەو ناوچەکە دێن.

## د- لە روانگەی [ سەرمایەگوزاری کەرتی تایبەت][١٧]:-

١- حکومەت یان کەرتی تایبەت پێویستە لەپرۆژەکانی سەرخان و ژێرخانی ئابووری لەبواری گەشتیاریدا سەرمایەگوزاری بکەن، بۆ زیاتر گرنگی دانی زیاتر بە گشت ناوچە گەشتوگوزارییەکانی هەرێمی کوردستان بێ جیاوازی، وەهەروەها پێویستە هاوسەنگی ژینگەیی ناوچەکە لەبەرچاوبگیرێت و خواست و ئارەزووی ناوچەکە بەهەند وەربگیرێت.

٢- پێویستە لەسەر دەوڵەت هەندێک لەقورسایی ئەو سەرمایەگوزاریانەی بکەوێتە سەرشان کەسودێکی گشتیان بۆ دەوڵەت تێدایە، وەک ژێرخانەکانی (رێگاوبان و گواستنەوە و گوندە

گەشتوگوزارییەکان). ئیتر کەرتی تایبەت پارەکانی خۆی لەبواری تری گەشتیاری دەخاتە روو ئەویش وەک کارئاسانی بەو مەرجەی دەولەت لەنەخشەکێشانی پەرەپێداندا هەماهەنگی لەگەڵ کەرتی تایبەتدا بکات.

٣- پێویستە ئەو پرۆژانەی گەشتوگوزار کە حکومەت بودجەیان بۆ تەرخان دەکات، ژمارەیان زۆرتر بکرێت بەتایبەتی لەو ناوچانە کەتێدا کەرتی تایبەت گرنگی و بایەخی زۆری پێ دەدات.

٤- پێویستە لەسەر حکومەت کەرتی تایبەت هان بدات سەرمایەکانیان لەکەرتی گەشتوگوزاردا بخەنە گەڕ، چونکە پرۆژەکانی گەشتوگوزارو هوتێلەکان بەگشتی پێویستیان بە بودجەیەکی زۆرو بەشارەزاییەکی زۆر هەیە، ئەمەش نابێتە هاندەر بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆژە ستراتیجیانە، بۆیە پێویستە لەسەر حکومەت لەڕووی کارگێڕی و ماددی و تەکنیکیەوە دەستی یارمەتی بۆ ئەو پرۆژە گەشتوگوزاریانە درێژ بکات کە رەهەندیکی ئابووری و نیشتیمانیان هەیە.

٥- پێویستە سەرمایەگوزاری کەرتی تایبەت لە بواری گەشتیاریدا دەسکەوتی کۆمەلایەتی و ئابووری و خۆشگوزەرانی بەدیبهێنێت، ئەمەش لەڕوانگەی گرنگیدان بە ژینگەی سروشتی و دابینکردنی ئاسانکارییە گەشتوگوزارییەکان بەشێوازێکی نوێی سەردەمانە.وەپێویستە لەسەر حکومەت گیروگرفتی یاساییان بۆ نەهێنێتە پێش و متمانەی کارکردنیان پێ ببەخشێت و دەستەیەکیش لە وەزارەتەوە سەرپەرشتی کارەکانی کەرتی تایبەت بکات لە هەرێم و ناوچەکانی تر.

## ژ- لەروانگەی [گرنگی دان بە جۆرەکانی گەشتوگوزار]

گرنگی دان بە جۆرەکانی گەشتوگوزار بەپێی مەبەست و پاڵنەرەکان لایەنێکی تری پێشکەوتن و گەشەکردنی بزاڤی گەشتیارییە کەخۆی ئەبینێتەوە لە[١٨]:-

١- **گەشتوگوزاری ئایینی**:- گرنگیدان بە شوێنەوارو مەزارگە و پەرستگا ئایینییەکان و ئەنجامدانی مەراسیم و نوژەنکردنەوەی شوێنە ئاینی و مزگەوتەکان و دابینکردنی خزمەتگوزاری زیاتر. وەکو (پەرستگای لالش شەنگال و ئەشکەوتی چارستیین لەدهوک )

٢- **گەشتوگوزاری چارەسەری**:- گرنگیدان بە سەرچاوە و کانیاوە تەندروستیەکان و کانیاوە گەرمەکان و ئاوەکانزاییەکان و گەرماوەکان وە بەگەرخستنی سەرجەم سەرچاوە سروشتی و مرۆییەکان بەمەبەستی سوود لێ وەرگرتنیان بەمەبەستی چارەسەری تەندروستی و دروستکردنی هەوارگەو مەڵبەندی چارەسەری تەندروستی بۆ خزمەتکردنی گەشتیاران وەک (گەرماوی حمام عەلی و حەمامۆک و گەراوی ڕانیە)٠

٣- **گەشتوگوزاری کۆنگرەکان**:- گرنگیدان بە کۆنگرە نێودەوڵەتی و زانستی و پیشەیی و هونەری چالاکی ڕێکخراوەکانی کومەڵگای مەددنی و حکومی و سەردانی وەفدە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان و دابینکردنی پسپۆرانی و کادیرانی ڕێکخستنی کۆنگرەکان.

٤- **گەشتوگوزاری وەرزشی** :- گرنگیدان بەچالاکیە وەرزشییەکان بەمەبەستی چێژ وەرگرتنی دەروونی و جەستەیی و تێرکردنی ئاردزووی گەشتیاران.وەک (هەڵخلیسکان و ڕۆیشتن بەناو بەفرو

سوارբوونی ئەسپ و مەلەوانی و پێشبڕکێی پاسکیل و ماتۆرسواری و ئۆتۆمبیل و دروستکردنی تەلەفریک لەناوچە بەرزاییکانی کوردستان.

٥- **گەشتوگوزاری کلتوری**:- گرنگیدان بە گەشتوگوزاری رۆشنبیری و بەستنی کەرنەڤاڵ و ئاهەنگ و بۆنە کۆمەلایەتیەکان و گرنگی دان بە مۆزەخانەو عەنتیکەخانەو ئالوگۆری کلتوری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری.

## لیستی سەرچاوەکانی بەشی دووەم:-

(١)شێروان عومەر رشید، بنەماکانی جوگرافیای سروشتی دروست بوون و گەشەپێدانی گەشتو گوزار لەپارێزگای سلێمانی، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٩٩.

(٢) بە پشتبەستن بەم سەرچاوانە :-

أ- خالید هادی چاوشلی ، گرنگی و سیمای گیروگرفتی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ، ژمارە (١٣) ، ساڵی سێ یەم، ئەیلوولی، هەولێر،١٩٩٩،لا ١٥-١٥٩.

ب- www.kurdclick.net.

ج- شێروان عومەر رەشید، بنەماکانی جوگرافیای سروشتی گەشەپێدانی گەشتوگوزار لەپارێزگای سلێمانی،سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠٣-٢٠٤.

چ - لوقمان وسو عومەر ، سەرچاوەی پێشوو، لا١٥٨.

ه- پرۆفیسۆر. د.ئازاد نەقشبەندی، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، سەرچاوەی پێشوو،لا٢٥٩.

(٣) شەماڵ نوری، گەشتوگوزار داهاتێکی لەبیرکراوی هەرێمی کوردستان، گۆڤاری ئابووری سیاسی، سەندیکای ئابووریناسانی ئابووری، زمارە (٢٨) ، ساڵی هەشتەم،هەولێر، ٢٠١٠،لا٢٥.

(٤) خالید هادی چاوشلی، سەرچاوەی پێشوو، لا١٥٧-١٥٨.

(٥) د. نور الدین هرمز، التخطیط السیاحی والتنمیه السیاحیه، مجله جامعه تشرین للدراسات والبحوث العلمیه، سلسله العلوم الاقتصادیه والقانونیه المجلد (٢٨) العدد (٣)٢٠٠٦،ص١٩.

(٦) www. tegnelogyi.blogspot.com

(٧) شەمال نوری ، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٢.

(٨) www.toursmguide.com

(٩) د. جەزا توفیق طالب ، المقومات الجیوبولتکیه الامن القومی فی الاقلیم کردستان،ص٣٢٢-٣٢٣.

(١٠) محمود الديماسي وأخرون ، تخطيط البرامج السياحيه، دارالمسيره، عمان، بدون سنه طبع، ص١٥٩ .

(١١) كۆمەڵەی كوردستانیكی سەوز- لقی رانیە، گۆڤاری رانیە، ژمارە(١٦)، شارەوانی رانیە دەری ئەكات، ساڵی ٢٠٠٦، لا٤٣-٤٤.

(١٢) پشتیوان شەفیق ئەحمەد، گەشەی شارنشینی و كاریگەری لەسەر رەوشی ئابووری، گۆڤاری سیاسەتی ئابووری ، ژمارە (٢٧)، ساڵی هەشتەم ،سەندیكای ئابووری ناسانی كوردستان،هەولێر،٢٠١٠.لا١٣-١٤.

(١٣) د. محمد عبدالفتاح احمد و طايع عبد اللطيف گه، السياحه الداخليه، الجغرافيا السياحيه، جامعه عين الشمس، بدون طبع، بدون المطبعه، مصر،٢٠٠-٢٠٠٩، ص٩٣.

(١٤) attdc.kuiraq.com.www

(١٥) د.نور الدين هرمز، المصدر السابق ،ص٢٤.

(١٦) المؤسسه العامه للتعليم الفنى والتدريب المهنى، المواريد السياحيه، سفر وسياحه، جغرافيا السياحه والطيران، المصدر السابق، ص٣٩.

(١٧) ئیدریس سلێمان عبدالله، فاكتەرە كاریگەرییەكانی وەبەرهێنان لەبواری گەشتوگوزاردا، گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی (٥٦)، ژمارە (٣)، ساڵی شانزەهەم، ئابی ٢٠٠٨، لا١٤٠-١٤١.

(١٨) www.ar.wikipedia.org

## دەرەنجام:-

لەبەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی بنەما جوگرافیە گەشتوگوزارییەکان دەتوانین ئەم دەرەنجامانە بخەینە ڕوو:-

١- دەرەنجامی هەموو ئەو توانستە سروشتی و مرۆییانەی کە هەرێم بەدی دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی زیاتر هەستی پێدەکرێت لە ڕاکێشانی سەرنجی گەشتیاران بەرەو ناوچە گەشتوگوزارییەکان زیاتر توانستە سروشتیە گەشتوگوزارییەکانن بەراورد لەگەڵ توانستە مرۆییەکان.

٢- ( هەرێمی کوردستان) لەڕووی شوێنی جوگرافییەوە دەردەکەوێت کەڕووبەرێکی فراوانی دەکەوێتە ناوچە شاخاویەکان، گرنگترین شوێنە گەشتوگوزارییەکانی ناوچەی لێکۆلینەود پێک دەهێنێت، چونکە هەرچوار وەرزەی ساڵی تێدا دەردەکەوێت، ئەمەش ئەوە دەردەخات لەهەر وەرزێک بۆ جۆرێکی تایبەتی گەشتوگوزاری سوودی لێوەر دەگیرێت.

٣- ئاووهەوای گەشتیاری لەهەرێمی کوردستان لەوەرزە گەشتیاردەکاندا ئاووهەوایەکی مام ناوەندە کە گەشتیار هەست بە پشرووی جەستەیی ودەروونی دەکات، لەماوەی پیادەکردنی هەر جۆرە چالاکیەکی گەشتیاریدا،ئاووهەوا لەناوچە گەشتوگوزاریەکاندا وەرزانەی گەشتوگوزار دیاری دەکات،وەرزی گەشتوگوزار لەهەرێمی کوردستان دەکەویتەمانگەکانی(ئازارونیسان) لەوەرزی بەهار و مانگەکانی(حوزەیران و ئەیلوول)لەمانگی هاوین.

٤- کەمــی و نەبــوونی شــوێنی حەوانەوە، ئەمە بەگرنگتــرین ڕەگەزەکـانی خزمەتگـوزاری دادەنـدرێت چـونکە گەشـتیار لەگەڵ گەیشتنی بۆ هەر نـاوچەیەکی گەشـتیاری بیـر لەجێگـای حەوانەوە دەکـــاتەوە، لە هەرێمـــی کوردســـتان لەزۆربەی شــــوێنە گەشتوگوزارییەکاندا بەئاشکرا هەست بەنەبوونی شـوێنی حەوانەوە دەکرێت.

٥- نەبــوونی وێســتگەیەکی کەشناســی لەزۆربەی شــارو شـارۆچکەکان و نـاوچە گەشـتوگوزارییەکان هۆکـارێکە بـۆ نەبونی زانیـاری درووسـت بـۆ دیـاریکردنی ئـاووهەوای گەشـتیاری لەسـەر چالاکییە جۆربەجۆرەکانی گەشتوگوزار.

٦- نەبوونی ئاسانکارییە گەشتوگوزارییەکان لەهەرێمدا کەخۆی لە(ئوتێل و کافتریاو پارک و چێشتخانەو ...هتدد) دەبینێتەوە یەکێکن لەگرنگتــرین ئەو کۆســپ و ئاســتەنگانەی کەڕووبەرووی کەرتــی گەشتوگوزاری دەبێتەوە .

٧- هەرێمـی کوردسـتان چەنـدین ڕێگـای هـاتووچۆی تێدا بەدی دەکرێـت کەخــزمەت گــوزاری جۆراوجــۆر پێشــکەش بەنــاوچە جیاوازەکـان دەکـات، بەڵام هەڵسـەنگاندنی چەنـدیەتی و چۆنیەتی و چالاکی ئەم ڕێگایانە بۆ پەرەپێدان و گەشـەکردنی گەشـتوگوزار بە شــێوەیەی ئێســتا خزمەتگــوزاری تەواو پێشــکەش بەکەرتــی گەشــتوگوزاری ناکـات، بەڵام خەونەکـان بۆگەیانـدنی ڕاکێشـانی ڕێگاوبان بۆ ناوچە گەشتوگوزارییەکان بەردەوامن.

٨- سەقامگیری بارودۆخی ئاسایش لەهەرێمی کوردستان وەک دوورگەیەکـی ئـارام بـۆتە فـاکتەرێکی گرنـگ بـۆ پێشـکەوتنی بزاڤی

گەشتوگوزار، چونکە ڕۆڵی سەقامگیری ناوچە گەشتوگوزارییەکان لەڕووی ئەمن و ئاسایشەوە لە هەریم بۆتە هۆی دەستەبەرکردنی کەشێکی ئارام و دوور لەهەر مەترسییەک کەئەمەش هاندەریکە بۆ پێشکەوتنی کەرتی گەشتوگوزاری.

٩-ئەو فاکتەرانەی بەرپرسن لەهاندانی دانیشتوانی لەهەریمی کوردستان دەووروبەری کە ڕووبکەنە ناوچە گەشتوگوزارییەکان بۆ ئەنجامدانی چالاکیە گەشتوگوزارییەکان جۆربەجۆرەکان، زیادبونی ژمارەی دانیشتوان و بەرزبوونەوەی ئاستی بژیووی و بوونی پشووی داموودەزگا حکوومییەکان و دوورکەووتنەوە لە جەنجالی شار.

١٠- بوونی شوێنەواری مێژوویی هەرێمی کوردستان بەشداری لەبەهیزکردنی بنەما شارستانی و کۆمەڵایەتیەکانی تایبەت بەناوچە گەشتوگوزارییەکان دەکات، کەبوونی ئەمانەش لەناوچەکەدا هۆکاریکن بۆ تێرکردنی حەزوو ئارەزووەکانی گەشتیاران، بوونی ئەم شوێنەوارە مێژووییانە هۆکارێکن بۆ کردنەوەی ناوچە داخراودکان و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریان.

١١- هەرێمی کوردستان دەوڵەمەندە بەدەرامەتی سامانی ئاوی جۆراوجۆر(زێ و چەم و ئاووی ژێر زەوی و کانیاوی کانزایی و کانیاوی گەرم) سەرچاوە ئاوییەکان نەک لەڕووی چەندیەتی ئاودکەی و گونجاندنی شوێنی جوگرافی و فاکتەرەکانی راکێشانی گەشتیاری گونجاوە.

١٢- هەرێمی کوردستان لەناو زنجیرە شاخەکاندا کۆمەڵێک دیاردەی جیۆمۆرفۆلۆجی جیاوازی دیاردەکانی سەر ڕووی زەوی

پێک دەهێنێت، کەدەبێتە هۆی هەمەجۆری ڕەگەزەکانی خستنە ڕووی گەشتیاری، کەگەشتیار دەتوانێت لەماوەی گەشتەکەیدا چەندین ڕووخساری جۆراوجۆری زەوی ببینێت،کەئەمەش لایەنێکی گرنگی پڕکردنەوەی حەزوو ئارەزووی گەشتیارانن بۆ ئەنجامدانی کۆمەلێک چالاکی گەشتوگوزاری.

## راسپاردەکـــان:-

لەبەر ڕۆشـنایی لێکـۆلینەوەو شـیکردنەوەی بنەمـا جـوگرافیە گەشـتوگوزارییەکان دەتـوانین ئەم پێشـنیارو ڕاسـپاردانە بخەیـنە ڕوو:-

١- هەبوونی بنەما و توانستە گەشتوگوزارییەکان بۆ پەرەپێدان و پێشـکەوتنی گەشـتوگوزار بەتەنهـا بەس نـیە، بەڵکـو پەیوەسـتە بەچـــۆنیەتی و بەکارهێنـــانی ئەو توانســـتانە بەمەبەســـتی گەشتوگوزاری، وەهەروەها پێویستە گرنگی بەهەموو جۆرەکانی گەشتوگوزاری بدرێت.

٢- بـــوونی سیاســـەتێکی ڕوون و ئاشـــکرا لەلایەن حکـــوومەتی جیهـــانەوە ســـەبارەت بە گەشـــەپێکردن و پەرەپێـــدانی کەرتـــی گەشـــتوگوزاری، ئەمەش لەڕێگـــای کـــردنەوەی بەڕێـــوەبەرایەتی گەشتوگوزاری لەسە رجەم قەزاو ناحیەکان، هەروەها دابین کردنی کادیری پسپۆڕو شارەزا لەبواری کاروباری گەشتیاریدا.

٣- بوونی چەند وێستگەیەکی کەشناسی لە نـاوچەی لێکۆلینەوە، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی وورتـرو ڕاسـت تـر لەکاریگەری ڕەگەزە جیاوازەکانی ئاووهەوا لەسەر چالاکییە گەشتوگوزارییەکان.

٤- نەهێشـــتنی ئەو کـــاروو دیـــاردانەی کەدەبنەهـــۆی نەمـــانی سـەوزایی لەژینـگەی گەشـتوگوزاریدا،وەک (دار بـڕین و سـوتان) کەسـەرەنجام دەبێـتە هـۆی لەدەسـت دانـی جـوانی سروشـت و تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەی گەشتیاری لەناوچەکەدا.

٥- نەهێشتنی دیاردەی پیسبوونی هەوای سروشتی لەدەوروبەری ناوچە گەشتوگوزارییەکان بەبێ هۆو هیچ مەبەستێک،وەکو سووتاندنی کەلوپەل و پاشماوەی گەشتیاران لەناوچەکەدا، بەڵکو پێویستە ئەم پاشماوانە لە شوێنێکی گونجاو دوور لەناوچە گەشتوگوزاریەکان بسووتێندرێت.

٦- نەهێشتنی ئەو کارو دیاردانەی کەدەبنە هۆی نەمانی ئاژەڵ و پەلەوەری کێووی کەئەمانە سامانی سرووشتی هەر وولاتێکن، وەک ڕووکردن هەروەها ڕوکردنی ماسی لەکاتی زاووزێدا.بەتایبەتی بەتەقەمەنی و یان ماددەی ژەهراویی و کیمیاویی و کارەبا.

٧- دابینکردنی سەرجەم خزمەت گوزارییە ئاسانکاریە گەشتوگوزارییەکان وەک (ئاو و کارەبا و ئووتێل و چێشتخانە و پارک و مەلەوانگە.......هتدد) لەناوچە گەشتوگوزارییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بەنرخێکی گونجاو.

٨- هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێنمایەکانی تەندرووستی مرۆڤ و ژینگە پارێزی لەڕێگای کەناڵەکانی ڕاگەیاندن (تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، ڕۆژنامە). وەهەروەها بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری گەشتیاران لەسەر پاراستنی ناوچە گەشتوگوزاریەکان و کاری نەمام ناشتن و دارنەبڕین، وە دروست کردنی چەند بنکەی تەندرووستی لەناوچە گەشتوگوزارییەکان.

٩- دروست کردنی شوێنی تایبەت لەناوچە گەشتوگوزاریەکان بۆ حەوانەوەی گەشتیاران.وەهەروەها پێویستە ئەم شوێنانە نرخێکی

گونجاوی هەبێت کەگەشتیاران تێکڕا بەیەکسانی کاتی خۆیان تێدا بەسەر بەرن.

١٠- تیمێکی گەڕۆک یان دەستەیەکی گەڕان و پشکنین پێک بێت کە لەو دەستەدا شارەزایان وکادیرانی بواری گەشتوگوزاری لەخۆ بگرێت، بۆ دەستنیشانکردنی ئەو شوێنانەی کە بۆ گەشتیاری دەشێت و شوێنە نوێیەکان گرنگیان پێ بدرێت.

١١- چاپکردنی ڕێبەری گەشتیاری (دلیل السیاحی) و دابەش کردنیان بەسەر گەشتیاران.کەتایبەت بەناساندنی ناوچە گەشتوگوزاری سروشتی و مرۆییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە، هاوپێچکردنی بەنەخشەی شوێنی جوگرافی و ڕێگای گواستنەوەو چۆنیەتی گەیشتن بەم ناوچانە.

١٢- دابینکردنی هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندنی گەشتیاران بەناوچە گەشتوگوزاریەکان، بەمەبەستی ئاسانکردن و پاراستنی گیانی گەشتیاران و کەمکردنەوەی پاڵەپەستۆی هاتووچۆو ڕوودانی کارەسات و پیسبوونی ئاووهەوای ناوچە گەشتوگوزایەکان،هەروەهابەستنەوەی ناوچەی نیشتەجێ بوون بەناوچە گەشتوگوزارییەکانەوە.

١٣- هەوڵدان بۆ بوژانەوەی دیاردە کۆمەلایەتی و فۆلکلۆری و پیشە دەستیەکانی ناوچەکە.لەڕێگای ڕێکخستنی یاری فۆلکلۆری و ئاهەنگ و وەرزی ئەسپ سواری و پیشانگاو ئیشەدەستیەکان.هەروەها سوود وەرگرتن لەئاسەوارو ناوچە مێژوویەکان وەربگیرێت بەمەبەستی نوێکردنەوەی چالاکی گەشتیار.

١٤- گرنگی دان بەرێکخستنی هاوسەنگی نێوان ژینگەی ناوچە گەشتوگوزاریەکان و زیادبوونی ژمارەی گەشتیاران، پێویستە ڕەچاوی توانای ناوچەکە لەبەرچاو بگیرێت، ئەمەش هۆکارێک دەبێت بۆ کەمکردنەوەی ئەو فشارە جەستەیی و دەروونیانەی کەڕووبەڕووی گەشتیار دەبێتەوە لەناوچەکەدا.

١٥- دامەزراندنی ناوچەی گەشت و گوزاری لە ناوچە بەرزاییەکان چونکە زۆرترین مانگەکانی حەوانەوەی گەشتیاری بە تایبەت لە وەرزی هاویندا دەگرێتە خۆ.

١٦- دامەزراندنی لیژنەیەکی پسپۆرو شارەزا بۆ فراوانکردن و پێشخستنی ناوچە گەشت و گوزارییەکان و دەستنیشانکردنی ئەو شوێنانەی کە دەکرێت لە داهاتوودا سودی لێوەربگیرێت لەڕووی گەشت و گوزاریەوە.

١٧ هاندانی کەرتی تایبەت و دانانی بودجەیەکی پێویست بۆ بەرهەم هێنانی گەشتیاری و ئاسانکاری بۆ وەبەرهێنە ناوخۆیی و دەرکیەکان.

١٨- گرنگی دان بە فۆلکلۆرو پیشەو بەرهەمە میللی و نەتوەییەکان و زیندوو کردنوەی ئەو بەرهەمانەی کە لەناوچوون.

١٩- کردنەوەی سەنتەرەکانی تایبەت بە تەلەفۆن و فاکس و ئەنتەرنێت.

٢٠- هۆشیارکردنەوەی دانیشتوانی ناوچەکە لە قازانج و داهاتی گەشت و گوەزاری تا حەزو ئارەزووی دانیشتوانی لەسەربێ .

٢٤- كردنەوەی كولیژو پەیمانگاكان تایبەت بە گەشت و گوزار و پەرەپیدانی، تا كادیری پیشكەوتووی ئەو بوارە بەرهەم بهینریت بۆ خزمەتگوزاری گەشتیاران.

٢٥- دروستكردنی مەلەوانگە و پاركی تایبەتی و شاری یاری و هۆلی تایبەت بۆ ئاهەنگ و شانۆو یاری و نمایشی بەرهەمە فۆلكلۆریەكان و میللیەكان.

٢٦- بوونی دەزگای حكومی تایبەت بە ئاسانكردنی كارەكانی گەشت و گوزاری و پۆلیسی تاوان و هاتووچۆو ئارامی.

٢٧- باشكردن و فراوانكردنی پەیكەری بۆ خزمەتگوزاری گەشتیاری لە ڕێگای زیاكردنی فڕۆكەخانەو باشكردنی هۆیەكانی كۆنترۆڵكردنی جولانەوەی ئاوی وشكانی و ئاسمانی هەروەها خزمەتگوزاریە پێوستیەكان لە ناوەندەكانی سنور لەبەرئەوەی ئێستا ناوەندەكانی سنور زۆر گرنگە بۆ پێدانی زیانباری بۆ گەشتیار بۆ ئەو ناوچایەی كە سەردانی دەكات.

٢٨- دروستكردنی ناوەندی گەشتیاری نیشتیمانی لەو ماوەیەدا یارمەتی دەدات بە پێشكەوتنی خزمەت گوزاری گەشتیاری بۆ گەشتیار وە خزمەت گوزاریەكانیش ئەمانەن.

٢٩- كردنوەی بازاڕی بازرگانی ئەمە لەماوەی بنیات نانی دەزگای بلاوكردنەوەی حوكمی بۆ چاودیری گەشتیار بۆ نەهێشتنی بیزاركردنی گەشتیار.

٣٠- ئاسانكردنی لیپرسینەوەكان بۆ بەدەست هینانی هاتنەناوەوەی لەماوەی كەمكردنەوەی لیپرسینەوەكان و ئاسانكاری بۆ بەدەست هینانی فیزای گەشتیاری . وە توانای دابینكردنی

## لیستی سەرچاوەکان:-

### أ- کتێبە کوردییەکان :-

١- ئاویستا خالید محمد و هەوار تاهیر کەریم، شوێنی ئەسترۆنومی، ئەتڵەسی پارێزگای سلێمانی، چاپخانەی حمدی، سلێمانی،٢٠٠٤.

٢- پرۆفیسۆر. د.ئازاد نەقشبەندی ،سەیران و گەشتوگوزار، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، کتێبی سەنتەری برایەتی (٣) ،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،چاپی یەکەمن هەولێر،١٩٩٨.

٣- شێروان عومەر رەشید، ئاستەنگەکانی بەردەم گەشەپێدانی گەشتوگوزار و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، بنەماکانی جوگرافیای سروشتی گەشەپێدانی گەشتوگوزار لەپارێزگای سلێمانی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، بێ شوێنی چاپ ، بی بەرگ، سلێمانی ،٢٠٠٧.

٤- لوقمان وسو عومەر، توانستە جوگرافیە سروشتیەکان، توانستە جوگرافیە گەشتوگوزاریەکانی قەزای کۆیە، نامەی ماجستێر(بڵاونەکراوە)، پێشکەشی کۆلێژی پەروەردە کراوە، لە زانکۆی کۆیە، بەشی جوگرافیا، ٢٠٠٦.

### ب- گۆڤارە کوردییەکان:-

١- ئیدریس سلیمان عبداللە، فاکتەرە کاریگەرییەکانی وەبەرهێنان لەبواری گەشتوگوزاردا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی (٥٦)، ژمارە (٣) ، ساڵی شانزەهەم، ئابی ٢٠٠٨.

٢- پشتیوان شەفیق ئەحمد، گەشەی شارنشینی و کاریگەری لەسەر رەوشی ئابووری، گۆڤاری سیاسەتی ئابووری ، ژمارە (٢٧)، سالی هەشتەم ،سەندیکای ئابووری ناسانی کوردستان،هەولێر،٢٠١٠.

٣- شەماڵ نوری، گەشتوگوزار داهاتێکی لەبیرکراوی هەرێمی کوردستان، گۆڤاری ئابووری سیاسی ، سەندیکای ئابووریناسانی ئابووری، زمارە (٢٨) ، ساڵی هەشتەم،هەولێر،٢٠١٠.

٤- خالید هادی چاوشلی، گرنگی و سیمای گیروگرفتی گەشتوگوزار لەهەررێمی کوردستان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٣)، ساڵی سێ یەم، ئەیلوولی، هەولێر،١٩٩٩.

٥- کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز- لقی رانیە، گۆڤاری رانیە، ژمارە(١٦) ، شارەوانی رانیە دەری ئەکات، ساڵی ٢٠٠٦.

**چ - ئەنتەرنێت:-**

١- www.kurdclick.net

٢- www.ar.wikipedia.org

٣- www. tegnelogyi.blogspot.com

٤- www.toursmguide.com

٥- attdc.kuiraq.com.www

**کتێبە عەرەبیەکان:-**


١- د. محمد عبدالفتاح احمد و طايع عبد اللطيف طه، السياحه الداخيليه، الجغرافيا السياحيه، جامعه عين الشمس، بدون طبع، بدون المطبعه، مصر،٢٠٠-٢٠٠٩.

٢- محمود الديماسى وأخرون ، تخطيط البرامج السياحيه ، دارالمسيره، عمان، بدون سنه طبع ، ص١٥٩ .

٣- د. جەزا توفيق طالب، المقومات السياحيه فى اقليم، التنميه الريفيه والسياحيه فى اقليم كوردستان العراق، الطبعه الاولى، مكبعه رومان، سليمانيه، ٢٠٠٧،٣٣.

٤- د.احمد حسن ابراهيم، الموقع الجغرافى، جغرافيه السياحيه، دار القلم،٢٠٠٠.

٥- د.جەزا توفيق طالب ،الموقع الفلكى، النشاط السياحى فى اقليم كوردستان، المقومات الجيوبولتكيه الامن القومى فى الاقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجيه، سليمانيه، ٢٠٠٥.

٦- د.ئازاد محمدامين، المقومات الجغرافيه الطبيعيه لنشوو وتطور السياحه فى المنطقه الجبليه فى العراق، مقدمه فى الجغرافيه السياحيه مع دراسه التطبيقيه عن القطر العراقى، بغداد،١٩٨٠.

٧- عصام حسن السعيدى ، الدلاله والارشاد السياحى ، الطبعه الاولى، عمان، ٢٠٠٩.

٨- مصطفى يوسف كافى، اقتصاديات السياحه، الطبعه الاولى، سوريا، ٢٠٠٨.